أورخان محمد علي

# چەند لاپەڕەیەکی ڕەنگین لە مێژووی عوسمانی



ئاوڕدانەوەیەکە لە مێژووی پڕ سەروەری ،
ئیمان و جیهاد و دادگەری و خۆنەویستی‌ی موسڵمانان

فاروق رسول یحیی
کردوویە بە کوردی

أورخان محمد علي



# چەند لاپەڕەیەکی ڕەنگین
# لە
# مێژووی عوسمانی

ئاوڕدانەوەیەکە لە مێژووی پڕ سەروەریی
«ئیمان و جیهاد و دادگەری و خۆنەویستی»ی موسڵمانان



فاروق رسول یحیىٰ
کردوویە بە کوردی

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم نامیلکەیە

* مامۆستا «أورخان محمد علي» لە سەرچاوە تورکی یەکانەوە وەری گرتووە و بە عەرەبی دایناوە
* یەکەم جار لە گۆڤارێکدا و بە چەند ئەلقەیەک بلاوکراوەتەوە
* پاشان بە شێوەی کتێب لەسالی (١٤١٧ك - ١٩٩٦ز) لە لایەن «دار الصحوة» لە قاهیرە چاپی یەکەمی بلاوکراوەتەوە.
* «فاروق رسول یحیی» لە عەرەبی یەوە کردوویە بە کوردی.
* چاپی یەکەم
* ١٤١٩ ك - ١٩٩٨ز
* مافي چاپ هی وەرگێرە.

## بسم الله الرحمن الرحيم

### پێشەکی

سەرجەمی موسڵمانان یەک نەتەوەن ﴿إِنَّ هَـٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً﴾ (الأنبياء:٩٢) ..

لەبەر ئەوە ، مێژووی هەر گەلێکی موسڵمان موڵکی هەموو نەتەوەی ئیسلامە

هەستکردنیش بەم هاوبەشی‌یە لە «مێژوو» و «چارەنووس» و «بەها رۆحی‌یەکان»دا گرنگترین پەیوەندی‌یە کە گەلانی ئەم نەتەوەی ئیسلامە بە یەکەوە گرێ دەدات

جا ئەم پەیوەندی‌بەی نێوان گەلانی موسڵمان گەورەترین نیشانە بووە کە تیری دوژمنانی ئاراستە کراوە ، بۆ ئەوەی نەتەوەی ئیسلام لاواز و وردوخاش بکەن و ئنجا بە تەواوەتی بیسڕنەوە و لەسەر نەخشەی جیهاندا نەیهێڵن کەسیش ناتوانێ پێ لەو ڕاستی‌یە نەنێت کە دوژمنان توانیان لە ئەنجامی بێ ئاگایی موسڵمانان‌دا چ سەرکەوتنێک لەم بوارەدا بەدەست بهێنن

بەڵام ئێستا پێشەنگی ڕابوون و بێداریی ئیسلامی لە سەرتاسەری جیهان‌دا دەیەوێ نەتەوەی ئیسلام بەخەبەر بێنێ و لە لایەکەوە مەترسی‌یەکانی ئەم پارچەپارچە بوون و تاقمگیری‌یەیان بۆ دەربخات و ، لە لایەکی تریشەوە مەودای نرخ و پێویستیی ئەم پەیوەندی‌یە بۆ موسڵمانان ڕوون بکاتەوە و ، بەم کارەش نەتەوەی ئیسلام لە مەترسیی شوێنکەوتەیی فیکری‌و سیاسی‌و داگیرکاریی شارستانێتی ڕزگار بکات ،

تاکو سەرلەنوێ کەسایەتیی سەربەخۆ و ڕۆڵی مێژوویی خۆی ببینێتەوە و جارێکی تر گەیاندنی پەیامە جیهانی و مرۆڤایەتی و شارستانی‌یەکەی خۆی بگرێتەوە ئەستۆ

بۆیە دەبێ مێژووەکەمان (مێژووی نەتەوەی ئیسلام) سەرلەنوێ بخوێنینەوە و لێی تێ‌بگەین ، نەک بۆ ئەوەی تەنها لە ڕابوردوودا بژین و خۆمانی تێدا مەلاس بدەین بەڵکو بۆ ئەوەی کەسایەتی و ڕەگ و ڕیشەی خۆمان بزانین و پێی ئاشنا ببین

لە ڕاستی‌دا ئێمە لە مێژووی زۆر گەلی موسڵمان نەشارەزاین و ئاگامان لە بەسەرهاتی گەلێ کەسایەتیی مێژووی ئیسلام نی‌یە و زۆر جاریش تەنها شتێکی کەم لە چەند قۆناغێکی مێژووەکەمان دەزانین

ئێمە وەختە هەر هیچ شتێک لە مێژووی موسڵمانانی ئەندۆنیسیا نەزانین و بە درێژی شارەزای بلاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام نین لەو ولاتەدا و ناوی ئەو کەسایەتیانەش نازانین کە نووری ئیسلامیان گەیاندووەتە ئەوێ و بلاویان کردووەتەوە

هەروەها شتێکی یەکجار کەم لە مێژووی ئیسلام و موسڵمانان دەزانین لە هیندستان و چین و ڕووسیا هتد

شتێکی کەم لە مێژووی «دەوڵەتی عوسمانی» شارەزاین لە کاتێک‌دا کە ئیمپراتۆرێتی‌یەکی ئەوتۆ بووە ڕۆڵی گەلێ گەورەی بۆ ماوەی سەدان ساڵ لە مێژوودا بینیوە

جا ئایا لەبارەی ئەم مێژووانەوە کێ زانیاریمان بۆ دەنووسێ ؟ (ئایا ئەم کارە بۆ دوژمنانی ئیسلام دابنێین ؟) ئەی ئایا مێژوونووسەکانی خۆمان لە کوێن ؟

ئەم هەژاری‌یەی لەمەڕ کتێبی مێژوو لە کتێبخانەی عەرەبی‌دا (بەڵکو لە هی زمانە ئیسلامی‌یەکانی تریش‌دا) یەکێکە لە لایەنەکانی کەم و کووڕی و ناتەواویی ئەو کتێبخانەیە

من نالێم ئەم کتێبەی بەردەستت کتێبێکە لە مێژوودا بەڵکو چەند چیرۆکێکی مێژوویی ڕاستەقینەیە لە چەند کتێب و سەرچاوەیەکی مێژوویی زۆرەوە هەڵم گۆزیون

ئەم چیرۆکانە گەلێ لەو لایەنە دەروونی و ، پەیوەندی و ، چەمکانە دەردەخەن کە لەو سەردەمانەدا باو بوون ، بە چەشنێکی باشتر لەوەی کە کتێبەکانی مێژوو دەریان دەخەن .. واتە دەتوانرێ ئەم کتێبە بە چەند دیمەن و وێنەیەکی نزیک دابنرێت بۆ هەندێ کەسایەتی و ڕووداو کەواتە کتێبێکی مێژوویی نی یە تاکو وێنەکە بە تەواوی دەربخات یان بە شێوەیەکی گشتی لە سەردەمێکی تایبەتی بدوێت و ڕووداوەکانی شی بکاتەوە

لەم چەند دیمەن و وێنە نزیکانەدا هێڵ و ڕوخسارەکانی هەندێ کەسایەتی و ڕووداوی مێژوویت بە جوانی بۆ ڕوون دەبێتەوە و ڕوخساری سەربەخۆ و جیاوازی کەسایەتیی ئیسلامیت بۆ دەردەکەوێت کە هەرگیز لە مێژووی کەسایەتیی نەتەوەکانی تردا هاووێنەی ئەمەت دەستگیر نابێت .

ئەم چیرۆکانەشم بە پێی زنجیرەی مێژووەکانیان ڕێک خستووە و زانیاریی پوختی مێژوویيم سەبارەت بە هەریەک لەو پادشایانە نووسیوە کە چیرۆکێک یان زیاتری لەبارەوە هێنراوە هەندێ جاری تریش چەند زانیاری یەک دووپات بوونەتەوە چونکە ئەم چیرۆکانە یەکەم جار لە شێوەی چەند وتارێکی ڕێک نەخراودا و ، لە گۆڤارێکدا بلاوکراونەتەوە. بۆیە پێویست بووە هەندێ لەو زانیاری یانە دووپات بینەوە

نۆرخان محمد علی

# ئۆرخان غازی

*چەند زانیاری یەکی مێژوویی لە بارەیەوە*

ناوی باوکی  عثمان غازی (دامەزرێنەری دەوڵەتی عوسمانی).

ناوی دایکی  مال خاتوون.

ساڵی لەدایک بوونی  ١٢٨١ز

ساڵی حوکمڕانیی : ١٣٢٦– ١٣٦٠ز

ساڵی کۆچی دوایی  ١٣٦٠

گرنگترین ئەو کارانەی ئەنجامی داون :

* فەتحی «ئەزنیک ، تاراکی ، ئەکوینۆک ، مودوردو ، کەملەک، ئەزمیت، کوبون، حیصار، هەرەکە، یالاوە، ئیسکودار، قاضی کۆی، دوورگەکانی مەرمەڕە، ئەنقەرە، ئابرووس، سەمەندیرە»

* هەروەک چەند میرنشینێکی نەهێشتووە و خستوونیەتە سەر دەوڵەتەکەی ، وەک میرنشینەکانی «کەردە ، فەتحی ، قەرصی»

* پایتەختی دەوڵەتی لە «یەنی شەهر»ەوە گواستەوە بۆ «بوورسە»

* یەکەم دراوی عوسمانیی لێداوە

* سلێمان پاشای یەکەم منداڵی ئەم پادشایە «رومللی» و «غالیبۆلی»ی فەتح کرد  بەڵام دوای تەواوکردنی ئەو فەتحانە لە بەسەرهاتێکی ڕاودا کۆچی دوایی کرد و «موراد»ی برای دوای وەفاتی «ئۆرخان»ی باوکی هاتە سەر کورسیی فەرمانڕەوایی

* کاربەدەستێکی دادگەرو خاوەن تەقوا بووەو ، بایەخی بە کاروباری هاوولاتییانی داوە ، تەنانەت مێژوونووسان دەڵێن  لە دوارۆژەکانی فەرمانڕەوایەتیی ئەودا هەژار نەمابوو موحتاجی وەرگرتنی زەکات بێت!

بایەخی بە زانستو زانایان داوەو لە کۆڕیاندا دانیشتووە .

«هالکۆندیل»ی مێژوونووسی ڕۆمی لەبارەیەوە دەڵێ

(سەبارەت بە سوارچاکان و پیشەسازان و هەژارانەوە سەخی و بەخشندە بووە ڕێزی زانایان و پاڵەوانانی لابووە مرۆڤێکی خاوەن تەقوا و دادگەر و بەوپژدان بووە و ، بەرامبەر گاورەکانیش نەرم و نیان بووە)

* * *

# بەرەو کیشوەری ئەورووپا
# بە هەشتا موجاهیدەوە !

«ئەمە بەسەرهاتی ڕۆشتنی عوسمانی‌یەکانە بۆ «ڕۆملی»
واتە کیشوەری ئەورووپا ، لە سەردەمی سوڵتان ئۆرخانی کوڕی
سوڵتان عوسمانی دامەزرێنەری دەوڵەتی عوسمانی‌دا »

دیوەخانە گەورەکە پڕبوو لە سەرداران و پیاوماقووڵانی عەشرەتی (قابی) هەر هەمووشیان چاوەڕوانی هاتنی «سوڵتان ئۆرخان»ی سەرۆکیان دەکرد کە ناردبووی بە دوایان‌دا تاکو لە کارێکی گرنگ‌دا کە هێشتا لای ئەوان نەی‌درکاندبوو ، پرس و ڕایان پێ بکات

داخۆ ئەو کارە چی بێ ؟ بۆچی ناردوویەتی بە شوێنیان‌دا ؟ ئایا بڵێی ڕێکەوتنێکی نوێ بێت لەگەڵ ڕۆمە بێزەنتی‌یەکان‌دا و دەیەوێ ڕایان بزانێ کەس نەی‌دەزانی کام لەمانەیە ، هەرچەندەش هەموویان لەناو خۆیان‌دا بە چپە ڕاوبۆچوونیان دەگۆڕی‌یەوە

هەر ئەوەندەی سەرەک هۆز خۆی‌کرد بە ژووردا و «سلێمان پاشا»ی کوڕەگەورەشی بە دوای‌دا هاتە ژوورەوە ، یەکسەر چپە و دەنگەدەنگ ڕاوەستا و بێ‌دەنگی باڵی بەسەر کۆڕەکەدا کێشا

سڵاوی موسوڵمانانەی ئاراستەی سەرجەمی ئامادەبووان کرد و وتی

– السلام عليكم و رحمة الله ..

هەموویان وەڵامی سڵاوەکەیان دایەوە و ، بە گشتی چاویان بڕیبووە ئەو ، تاکو بزانن چییان پێ دەڵێ

ئۆرخانی سەرکردەش چاوێکی بە ناو ئامادەبووان‌دا گێڕا و پاشان دەرگای لەسەر باسەکە خستە سەر پشت و پێی وتن

– برایانم ! ئەی هاوڕێیانی چەک‌هەڵگرم !

هەروەک دەزانن ئێمە شاری «بوورسە»مان خستە ژێر دەستەلاتی خۆمانەوە و کردمان بە پایتەختی دەولەتەکەمان ، بەم کارەش وەسیەتەکەی مەرحوومی باوکممان (سوولتان عوسمان) هێنایە دی هەروەک خوای گەورە لە فەتح‌کردنی چەندین قەلا و مەلبەندی ڕۆمەکانی ئەم ناوچەیەدا سەری‌خستین بە رادەیەک کە «بوانیس کانتکۆزینوسی شەشەم»ی پادشایان ناچار بوو ڕێکەوتننامەمان لەگەلدا تۆمار بکات ..

بەلام برایانم ! ئەم ئەندازەیە بەس نی‌یە بەلکو دەبێ بپەڕینەوە بۆ «ڕۆملی» (واتە بەری ئەورووپا ) تاکو لەوێش لەسەر «فتووحات» بەردەوام بین ..

جا ئێوە ڕاتان لەسەر چی‌یە و چی دەلێن ؟

یەکسەر موجاهید «فاضیل بەگ» کە یەکێک بوو لە فەرماندەکانی هێز ، هەلسایە سەر پێ و حەماسەت و غیرەت بە دەمارەکانی‌دا جۆشی دەدا و ، وتی

- الله أكبر .. الله أكبر .. لە مێژە چاوەڕوانی ئەم مژدەیەین خوا بەرەکەت بخاتە کار و تەمەنتانەوە فەرموون پێشمان بکەون ، ئێمە هەموومان لە پشتی سەرتەوە ئامادەی جیهادین

ئەم گەرم‌وگوڕی و حەماسەتەی «فاضیل بەگ» هەموو ئەوانی تریشی گرتەوە لە خۆشی‌دا باوەشـیان بە یەکتردا دەکرد و پیرۆزبایی‌یان ئاراسـتەی یەکتری دەکرد ئا لێرەدا «میر سـلێمان» بە گوێی باوکی(سولتان ئۆرخان)دا چپاند

- بابە گیان ! ئایا نامکەیت بە فەرماندەی ئەم هەلمەتە ؟

باوکی لە بەرامبەر ئەم ئاوات و ئارەزووەی کوڕە لاوەکەی‌دا زەردەخەنەیەکی کرد ، بەلام دوودل بوو لە هێنانەدیی داواکەی‌دا ، چونکە ئەم هەلمەتە پێویستی بە حیکمەتی فەرماندە و ئەزموونی کەسێکی خاوەن تاقیکردنەوەیە بۆیە پرس و ڕای بە فەرماندەکانی کرد و وتی

- سلێمانی کوڕم حەزی لە سەرکردەیی ئەم هەلمەتەیە ئێوە ڕاتان لەسەر چی‌یە ؟

فەرماندەکان میر سلێمانیان بە باشی دەناسی و شارەزای قارەمانی و ئازایەتی‌یەکەی بوون کاتێ لە جەنگەکانی پێشوودا هاوبەشیی لەگەڵدا کردبوون بۆیە هەموویان بە یەک دەنگ وتیان

– کارێکی زۆر باشە و ئێمەش لە فەرمانی دەرناچین و گوێڕایەڵی دەبین

– کەواتە دوای تەوەککول و پشت بەستن بە خوای گەورە ، دەیکەین بە فەرماندەی ئەم هەڵمەتە بەڵام برایانم ! تکام وایە یارمەتیی بدەن و ڕێنمایی بکەن ، چونکە ئەبێ ئەویش لە هەموو کاروبار و ئیشێکی ئەم هەڵمەتەدا پرس و ڕاتان پێ‌بکات

بەم جۆرە کۆبوونەوەکە کۆتایی پێ‌هات

لە بەرەبەیانی ڕۆژێک لە ڕۆژەکان‌دا جموجووڵێکی نائاسایی لە سەربازگەی موسوڵمانان‌دا بەدی دەکرا چونکە شمشێر و ڕمەکان تیژ دەکرانەوە و زرێی جەنگ لەبەر دەکران و دەنگی حیلەی ئەسپیش دەچوو بەگوێی ئاسمان‌دا

زۆری پێ نەچوو ، سوارچاکانی ئیسلام بەرەو باکوور بە غارغارێن کەوتنە ڕێ و زەوییان گرتەبەر تا وشکایی لەسەر ڕێیان‌دا کۆتایی پێ‌هات و گەیشتنە سەر لێواری دەریا.. ئەو دەریایەی کە دەکەوێتە نێوان خۆیان و کیشوەری ئەوروپاوە کە کیشوەرێکی نوێ‌یە و دەیانەوێ ئایینی ئیسلامی تێدا بڵاو بکەنەوە

سوپای موسڵمانان لەوێ خێوەتیان هەڵدا ، تاکو ڕێگا چارەیەک بۆ پەڕینەوە لەم دەریایە بدۆزنەوە

میر سلێمان هەمیشە بیری لە ڕێگاچارەیەک دەکردەوە بۆ ئەم کێشەیە. جارێکیان لە کەناری دەریاکەدا ڕاوەستا بوو چاوی بۆ ئەوبەری دەریاکە هەڵدەخست موجاهید «فاضیل بەگ» و «ئەجە بەی»ی سوارچاک لێی نزیک بوونەوە «فاضیل بەگ» لێی پرسی

– میرم ! بیر لە چی دەکەیتەوە ؟

– لە چۆنێتیی پەڕینەوەمان لەم دەریایەوە بۆ کەناری ئەوبەر ، بە بێ

ئەوەی دوژمن پێمان بزانن

- گەر فەرمانت لەسەر بێ ، ئێمە دەڕۆین و دەپەڕینەوە

- چۆن ؟ لە کوێوە ؟

- هەواڵمان زانیوە کە گەرووو(مضیق)یەکی نزیک هەیە دەتوانین لەوێوە بپەڕینەوە و ، دوژمن قەلایەکیشیان لەوێدا هەیە .

- باشە بڕۆن بپەڕنەوە ، بەلام یەکەم جار تەنها بۆ هەواڵ زانین و شارەزا بوون .

ئەوانیش گەیشتنە سەر دەربەندەکە و لە بنکی درەخت کەلەکێکی بچووکیان دروست کرد و ، هەر کە شەو داهات موجاهید «فاضیل بەگ» و «ئەجە بەی»ی سوارچاک و چەند کەسێکی کەمی بەجەرگ سواری ئەو کەلەکە بوون و پێی پەڕینەوە ئەوبەر . لەوێ یەکێکیان دی نوستبوو یەکسەر گرتیان و لەگەڵ خۆیاندا هێنایان بۆ لای «سلێمان پاشا»ی فەرماندەیان

ئەم مرۆڤە دیلە لە ترساندا دەلەرزی ، چونکە پێی وابوو دەی‌کوژن ! بەلام «سلێمان پاشا» هێوری کردەوە و خواردنی دایێ و دەستێک جل و بەرگی نوێی خەلات کرد و هەندێ دیاری تریشی پێ بەخشی ئەویش لە خۆشیاندا نەی دەزانی چی بکات !

پاشان «سلێمان پاشا» لێی پرسی

- ئایا دەتوانی شارەزای کەلێنێکمان بکەیت کە لەوێوە بڕۆینە ناو قەلاکە بێ ئەوەی کەس پێمان بزانێت ؟

- بەڵێ گەورەم ! دەتوانم .. من بە باشی شارەزای ئەو قەلایەم

- گەر ئەم کارەمان لەگەڵدا بکەیت و لە ڕاستیی ئەم بەڵێنەت دڵنیا ببین ، بەخششێکی زۆرت خەلات دەکەم !

- گەورەم بەڵێنت دەدەمێ کەس پێمان نەزانێ

یەکسەر سلێمان پاشا فەرمانیدا چەند کەلەکێکی گەورە دروست بکەن ئێوارەی ڕۆژی دووهەم ، دوای تەواوکردنی کەلەکەکان ، هەشتا قارەمانی لە سوارچاکانی هەڵبژارد و ، پێکەوە سواری کەلەکەکان بوون و

بە هێمنی و لە ژێر پەردەی تاریکی‌دا پەڕینەوە لێواری ئەوبەر ، بێ ئەوەی هیچ دەنگ و غەلبەغەلبێکیان لێ بێت کە پەڕینەوە پیاوە دیلەکە ڕێگایەکی نهێنی پیشاندان (١)

سلێمان پاشا و هەر هەشتا چەکدارەکە بە لەسەرخۆیی و هێمنی چوونە ناو قەلاکەوە کاتیش وەرزی کۆکردنەوەی بەرهەم و داهاتی میوە بوو لەبەر ئەوە ، زۆربەی دانیشتوانی قەلاکە دەرچووبوونە دەرەوە بۆ ناو باخ و بێستان و کێلگەکانی خۆیان لە دەوروبەری قەلادا بۆیە ئەمانیش بە ئاسانی دەستیان بەسەر قەلاکەدا گرت و دوژمن هیچ بوارێکی بەرگری لەخۆکردنی لەبەر دەست‌دا نەمابووەوە ، لەتاوا هەموویان تەسلیم بوون و بەم جۆرە خوێنی خۆیان پاراست و موسلمانانیش هیچ ئازارێکیان نەدان

سلێمان پاشا نەی‌هێشت کاتی بە فیڕۆ بدات ، بۆیە یەکسەر هەندێ لە سەربازەکانی نارد و دەستیان بەسەر هەموو کەشتی‌یەکانی ئەو قەلایەدا گرت کە لە لێواری دەریاکەدا لەنگەریان گرتبوو ، ئنجا ئەم کەشتییانەیان گەیاندە ئەوبەر و پاشماوەی سوپاکەیان پێ گواستەوە بۆ لای خۆیان

ئنجا پێش ئەوەی هەواڵی دەست بەسەرداگرتنی ئەم قەلایە بلاو ببێتەوە ، موسلمانان بە خێرایی هێرشیان بۆ قەلایەکی تری نزیک برد و ئەویشیان فەتح کرد بەم جۆرە بوون بە خاوەنی دوو قەلای گەورە لە خاکی ئەوروپادا ، تاکو بیکەن بە بنکە و جێ‌پێیان لە کیشوەرێک‌دا کە یەکەم جاریانە دەچنە ناوی

ئەمەبوو سەرەتای بلاوبوونەوەی موسلمانان لە کیشوەرێکی تردا کە لەمەودوا گەلێ جیهاد و فتووحاتی زۆری تێدا ئەنجام دەدەن

* * *

(١) هەندێ سەرچاوەی مێژوویی دەڵێن ئەو ڕێگا نهێنی‌یە زێرابی ئاوەڕۆی قەلاکە بووە کە ئاوە پیسەکانی لێ ڕۆکراوەتە ناو دەریاوە (دانەر)

# سوڵتان موڕادی یەکەم

*چەند زانیاری‌یەکی مێژوویی لە بارەیەوە*

ناوی باوکی   ئۆرخان غازی

ناوی دایکی   نیلوفەر خاتوون

ساڵی لەدایک‌بوونی   ١٣٢٦ز

ساڵەکانی حوکمڕانیی   ١٣٦٠ - ١٣٨٩ز

گرنگترین فتووحاتەکانی

* چەند کەنارێکی دەریای ناوەڕاست و ئەم قەڵایانەی فەتح کردووە «دیماتووکا ، بنار حەصار ، بابا ئەسکی ، لولوبورغازی ، کەشان ، سیزابوولوو ، فیزا ، کیرک کلیسە ، صاماکۆ ، جورلو»

* هەروەها ئەم شارانەشی فەتح کردووە

«ئەدیرنە ، یەنجە ، یانبۆلی ، ئیسلیمیا ، فیلیبازی ، بیگا ، قیزیل ئاغاج کارنیوفا ، ئەیدووس ، بورغاز ، ئانجەکیز ، فیراجک ، چەند بەشێک لە مەقەدۆنیا و نیش، جاتالاجە، ئیشتەب، مەناستر، صۆفیا، چەند بەشێک لە ئەلبانیا »

* پایتەختی وڵاتی گواستەوە بۆ شاری «ئەدیرنە»

* * *

# سوڵتانی شەهید

سوڵتان موراد یەکەم پادشایەکی غازی و موجاهید بووە ساڵە درێژخایەنەکانی حوکمڕانی‌یەکەی - کە سی ساڵی خایاندووە - بۆ فتووحات و فراوانکردنی دەوڵەتەکەی تەرخان کردبوو ، چونکە لەو کاتەدا کە حوکمڕانیی تێدا گرتەدەست ڕووبەری دوڵەتەکەی ۱۰۰۰۰۰کم² بوو ، بەڵام ئەم گەیاندی‌یە ٤۰۰۰۰۰کم² واتە چوار قات فراوانی کرد لەبەر ئەوە ئەم پادشایە بە یەکەم ئیمپراتۆر یاخود یەکەم سوڵتان دادەنرێ لە مێژووی دەوڵەتی عوسمانی‌دا ، چونکە «ئۆرخان»ی باوکی و «عوسمان»ی باپیری بە نازناوی «خان» ناودەبران

جا لەبەر ئەوەی زۆربەی فتووحاتی ئەم سوڵتانە لە کیشوەری ئەورووپادا بووە ، ئەوا سەرتاسەری دەوڵەتەکانی ئەورووپا ترسیان لەم هێزە لاوە هەمیشە گەشەسەندووە لێ نیشتبوو بۆیە «بولغاریا و صرب و بۆڵەندا و مەجەر» پەیمانێکیان لە نێوان خۆیاندا بەست و سوپایەکی هاوبەشی گەورەیان پێک‌هێنا و «لایووش»ی پادشای مەجەریان کرد بە سەرکردەی ئەو سوپایە ، تاکو موسڵمانان لە کیشوەری ئەورووپا دەربکەن و دووریان بخەنەوە

سوڵتان موراد لەگەڵ بەشی هەرە زۆری سوپاکەی لە شاری «بوورسە»ی پایتەختی دەوڵەتەکەی‌دا بوو بەڵام یەکێ لە سەرکردەکانی سوپا کە ناوی «حاجی ئیل بەی» بوو ، بە سەرکردەیی نزیکەی دە هەزار سەربازەوە لە شوێنێکی نزیکی سوپای بەرەوپێش‌هاتووی خاچ‌پەرستەکان‌دا بوو کە بەرەو سنووری دەوڵەتی عوسمانی دەهاتن ئەم سەرکردەیە بەرەو سوپای دوژمن ڕۆشت و لە ڕێگادا پێیان گەیشت

سوپای خاچ‌پەرستەکان چەندین ئەوەندەی هی عوسمانی‌یەکان دەبوون ، بەڵام لەبەر ئەوەی نەیان‌دەزانی کە سوپایەکی عوسمانی نزیکە لێیانەوە ،

ئەوا چاوەڕوانی هیچ هێرشێکیان نەدەکرد بکرێتە سەریان . بۆیە ئەم فەرماندە عوسمانی‌یە سوودی لە عونسوری ناکاو(عنصر المفاجأة) بینی و هێرشێکی برووسکە ئاسای کردە سەر سوپای خاچ‌پەرستەکان و شکستی پێ هێنان و تەفروتووناى کردن !

بە وێنەی برووسکە هەواڵی سەرکەوتنی موسڵمانان لەم جەنگەدا گەیشتەوە ئەورووپا ! بەم جۆرە هەموو هیوا و ئاواتێکیان درا بە بادا سەبارەت بەوەی کە بتوانن بە ئاسانی لە دەستی عوسمانی‌یەکان ڕزگاریان ببێت . بەڵام «پاپا ئەریانی پێنجەم» داوای لە هەموو دەوڵەتانی ئەورووپا کرد کە هەڵمەتێکی خاچ‌پەرستانەی نوێ و مەزنتر ئامادە بکەن تاکو بتوانن موسڵمانان لە کیشوەری ئەورووپا بەدەرنێن ، کەچی ئەو ترس و بیمەی کە دوای ئەم جەنگە لە ئەورووپی‌یەکان نیشتبوو هێندە گەورە بوو کە تەنانەت یەک پادشایش لە پادشایانی ئەورووپا بەدەم ئەم بانگەشەیەی پاپاوە نەڕۆشتن !

لەم لایشەوە عوسمانی‌یەکان لە «مەقەدۆنیا»دا لەسەر فتووحاتی خۆیان هەر بەردەوام بوون ئەمەش کارێکی کرد کە ترسی ئەورووپایی‌یەکان پتر زیاد ببێت و ، «لازار کرابلینۆفیج»ی پادشای «صرب» ناچار بوو پەیماننامەیەک لەگەڵ سوڵتانی عوسمانی‌دا مۆر بکات و بە پێی ئەو پەیماننامەیە ساڵانە باجێکی گەورە بە دەوڵەتی عوسمانی بدات . هەروەک «شیشمان»ی پادشای «بولغاریا» ڕۆشتە ژێر چاودێری و سایەی دەوڵەتی عوسمانی‌یەوە و «ماریا»ی خوشکیشی پێشکەشی سوڵتان کرد ! بەڵام دوایی لەم هەڵوێستەی خۆی پەشیمان بووەوە و وتی «خیانەتم لە خوێنی ئەو مەسیحی‌یانە کردووە کە وەک لافاو ڕژێنران» لەبەر ئەوە ، هەر کە پەیمانێکی نهێنی لە دژی دەوڵەتی عوسمانی بەسترا یەکسەر ئەویش هاوبەشیی تێدا کرد . ئەم پەیمانە «لازار»ی پادشای صرب سازی کرد و «توارتکۆی یەکەم»یش کە پادشای بۆسنە بوو ، ڕۆشتە ناو پەیمانەکەوە. پاشان پەیمانەکە فراوان بوو و «ئەلبانی‌یەکان» و «بۆڵەندی‌یەکان» و «بۆشناق»یش بەشدارییان تێدا

کــرد   پاشـــان به هەرهەموویان ســوپایەکی گــەورەیان پێکهێنا و سەرکردەیی ئەم سووپایەیان بە «لازار» سپارد   ئەم سوپایە هێندە زۆر بوو کە ئەم دروشمە لە ناو سەربازەکانی‌دا دەوترایەوە   «گەر ئاسمان بکەوێتە خوارەوە ، بە نووکی حەربەکانمان دەی‌گرینەوە» !

دوای چەند موفاوەزەیەکی سەرنەگرتوو ، هەردوو سوپاکە لە مەیدانی «قوصوە»دا خۆیان بۆ جەنگ ئامادە کرد   جا لەبەر ئەوەی سوپای خاچ‌پەرستەکان پێش عوسمانی‌یەکان گەیشتبوونە ئەم مەیدانە   ئەوا باشترینی ئەو تەپۆلکانەیان گرتبوو کە بەسەر مەیدانەکەدا دەڕوانێت و بەم کارەش خاڵێکی ئیجابییان بۆ خۆیان دەستەبەر کردبوو

شەوی پێش دەستکردن بە جەنگ «سوڵتان موراد» هەردوو دەستی ڕووەو ئاسمان بەرز کردەوە و بە دەنگی بەرز دوعایەکی کرد کە مێژوونووسان تۆماریان کردووە و   ئەمەی خوارەوە بەشێکە لەو نزا و لالانەوەیە

«ئەی پەروەردگار ! لەبەر حورمەتی پێغەمبەری خۆشەویستت ﷺ و ، لەبەر خاتری ئەو خوێنە خاوێنەی کە لە کەربەلادا ڕژا و ، تو حورمەتی ئەو چاوانەی کە لە ترسی تۆدا هۆن هۆن فرمێسک هەڵدەڕێژن و   بۆ خاتری ئەو ڕووانەی شەیدای عیشقی تۆ بوون ...»

هەر وا بەردەوام بوو   تا ئەوەی وتی

«بە نەصر و سەرکەوتنی خۆت یارمەتیی ئەهلی ئیسلام بدە و   لە تاوانەکانمان خۆش ببە و ، بەهۆی گوناهەکانمانەوە ئەو کسانە تەفروتوونا مەکە کە لە پێناوی تۆدا جیهاد دەکەن و ، ڕوومان لەناو خەڵکی‌دا ڕەش مەکە و   منیش بکە بە قوربانی ئایینەکەت و شەهادەتم بە نسیب بفەرموو ئەی پەروەردگارم» !

لە بەرەبەیانی ڕۆژی دوای ئەم دوعا و نزایەدا   واتە لە ١٣٨٩/٩/١٥زدا هەردوو سوپاکە ڕژانە ناو یەکەوە

سوڵتان موراد و «بایەزید»ی وەلی عەهد و گشت وەزیر و فەرماندەکان شمشێریان بە دەستەوە گرتبوو شان بە شانی سەربازەکان

لەگەڵ سوپای دوژمن‌دا دەجەنگان به تایبەتی «وەلی عەهد» لەم جەنگەدا ئازایەتی‌یەکی ناوازەی نواند، ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوون بو لەسەر ئەو نازناوی «هەورە بورووسکە»یەی کە لە ساڵی ۱۳۸٦زدا لێی نرابوو چونکە وەک بورووسکە دەی‌دا بەسەر دوژمنان‌دا

هەر لە ئێوارەی ئەو ڕۆژەدا جەنگەکە بە شـــکستی ســوپای خاچ‌پەرســـتان و کوشتنی «لازار»ی پادشا و سەرکردەیان و سەرکەوتنی سوپای موسڵمانان کۆتایی پێ هات .

ئەم جەنگە بە یەکێ لە جەنگە مێژوویی‌یە گرنگەکان تۆمار کراوە لە مێژووی جەنگەکانی جیهان‌دا

بۆ بەیانیی ڕۆژی دووهەم ، سوڵتان لەگەڵ وەزیر و فەرماندەکان‌دا بە ناو مەیدانی جەنگەکەدا دەگەڕا جەستەی کوژراوی هەردوولا مەیدانەکەی پڕ کردبوو سوڵتان بە دوای زامدارەکان‌دا دەگەڕا و فەرمانی گواستنەوە و تەداویکردنیانی بۆ سوپاکەی دەردەکرد لەم کاتەدا یەکێک لە فەرماندەکان هات بۆ لای سوڵتان و پێی‌وت

– گەورەم ! لە نێوان زامدارەکان‌دا یەکێک لە پیاوماقووڵانی صرب هەیە و دەیەوێ بت‌بینێت و لە بەردەمی تۆدا ئیســـــلام‌بوونی خۆی ڕابگەیەنێ .

– لە کوێ‌یە ؟

– ئەوەتا گەورەم ! ئەمەی وت و ، پەنجەی بۆ شوێنی ئەو زامدارە ڕاکێشا

– باشە با بڕۆین ئێمە ناتوانین دەست بە ڕووی داواکاریی کەسێکەوە بنێین کە بیەوێ موسڵمان بێ

ئەم زامدارە یەکێک بوو لە پیاوماقووڵانی صرب و ناوی «میلوروش کابیلۆفیچ» بوو زامەکەشی سووک بوو لە ڕاستی‌دا دەی‌ویست پادشای موسڵمانان بکوژێ کە ئەم شکستە سەختەی بەسەر هەموو سوپای ئەورووپادا هێنا بۆیە خەنجەرێکی لەناو جل‌وبەرگەکەی‌دا شاردبووەوە

سوڵتان و یاوەرانی لەم زامدارە نزیک بوونەوە ، ئەمیش بۆ پێشوازی لە سوڵتان هەڵسایە سەرپێ و ڕووبەڕووی سوڵتان هات و وای پیشان دا کە دەیەوێ دەستی سوڵتان ماچ بکات و لە ماوەی چاوتترووکاندنێکدا خەنجەرەکەی دەرهێنا و بە توندی کردی بە سنگی سوڵتاندا !

سوڵتان کەوت بەسەر دەستی فەرماندەکانیدا کە ئەوانیش ئەم موفاجەئەیە سەرسامی کردبوون !

سوڵتان هەر ئەوەندەی بۆ وترا

- ئەمە قەدەری خۆمە «بایەزید» لە جێگەمدا دابنێن

ئنجا شایەتمانی هێنا و گیانی سپارد !

بەم چەشنە ، خوای گەورە نزاکەی سوڵتان مورادی گیرا کرد و پلەی شەهیدیی بە خەلات پێ بەخشی

ئنجا سوپای عوسمانی بە سەرکەوتوویی لەگەڵ جەستەی پادشای شەهیددا گەڕانەوە بۆ شاری «بوورسە» و لەوێ ئەسپەردەی خاکیان کرد

سەبارەت بەو صربی‌یەش ، یەکسەر دوای شەهیدبوونی سوڵتان شمشێری سەربازەکان لەم لا و لەو لاوە دایان گرتەوە و هەر لەو شوێنەدا کوشتیانەوە

* * *

# سوڵتان بایەزیدی یەکەم

## کە بە نازناوی «ییلْدرم» (واتە هەورە برووسکە) بەناوبانگە

*چەند زانیاری‌یەکی مێژوویی لە بارەیەوە*

ناوی باوکی  سوڵتان موڕادی یەکەم.

ناوی دایکی  گوڵ جیجک خاتوون.

ساڵی لەدایکبوونی  ١٣٦٠ز

ساڵی چوونەسەرحوکمی  ١٣٨٥ز

بەرواری بەدیل‌گیرانی  ١٤٠٢ز

بەرواری کۆچی دوایی  ١٤٠٣ز

گرنگترین کارە جەنگی‌یەکانی

* خستنی صرب بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی

* سێ جار ئابلۆقەی قوستەنتینییەی دا ، بەڵام نەیتوانی فەتحی بکات.

* فەتحی ئیشکودار ، ئاماسیا ، تەواوکردنی فەتحی ئەلبانیا

* فەتحی «شیلە» و گشت میرنشینەکانی لێواری دەریای ڕەش

* فەتح کردنی بولغاریا ، بۆسنە ، سولانیک ، یەنی شەهر

* لابردنی گەلێ میرنشینی تورک لە ئەنادۆڵ و خستنیان بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی

* لە جەنگی «ئەنقەرە»دا کە لە نێوان عوسمانی‌یەکان و «تەیموور لەنگ»دا ڕووی دا  بە دیل گیرا و  دوای یەک ساڵ لە دیلی بە خەفەتەوە گیانی سپارد.

* * *

## «حەق» و «صەلاحییەت»

ئێمە ئێستا لە سەردەمی «سوڵتان بایەزیدی یەکەم» داین کە بە نازناوی «ییلدرم» بەناوبانگە ئەو سوڵتانەی کە لە ساڵی ١٣٩٠ز و لە سەردەمی ئیمپراتۆر «مانوێل»ی ڕۆمدا بە ئابڵۆقەدانی شاری «قوستەنتینییە» سام و مەترسیی خستە ناو دڵی جیهانی مەسیحی یەوە.

ئەنجومەنی پیاوماقووڵانی شاری ڤینیسیا لە ساڵی ١٣٩٣زدا کۆبوونەوە و بڕیاریان دا بانگەوازێک بۆ هەموو پادشایانی ئەوروپا بنێرن تاکو هەموو توانا و هێز و سوپایەکیان یەک بخەن بۆ جەنگی عوسمانی یەکان و دەرکردنیان لە کیشوەری ئەورووپا

لە لایەکی تریشەوە «سیگمۆند»ی پادشای مەجەر ڕێکەوتننامەیەکی نهێنیی لەگەڵ «شیشمان»ی پادشای بولغاریادا بەست لە دژی عوسمانی یەکان ئامانجی ئەم ڕێکەوتنەش گێڕانەوە و سەندنەوەی ئەو بەشەی ئەورووپا بوو کە عوسمانی یەکان لە سەردەمی مورادی یەکەمدا فەتحیان کردبوو

هەر ئەوەندەی «سوڵتان بایەزید» بەم ڕێکەوتنەی ئەوانی زانی یەکسەر هەڵمەتێکی بەهێزی ناردە سەر بولغاریا و ، ئەم هەڵمەتەش توانیی ڕووەو «تورنوفا»ی پایتەخت مل بنێت و ئابڵۆقەی بدات و پاشانیش فەتحی بکات ! ئنجا بەرەو پێشتر هەنگاوی نا و بە درێژایی ڕووباری «دانووب» دەستی بەسەر شارەکانی «سیلیسترا و نیکبۆلی و فیدین»دا گرت هەروەها توانرا «شیشمان»ی پادشای بولغاریا دیل بکرێت و بە دیلی ڕەوانەی شاری «ئەدیرنە» کرا ، کە ئەو کاتە پایتەختی عوسمانی یەکان بوو بەم جۆرە سەرتاسەری بولغاریا کەوتە ژێر دەستی عوسمانی یەکانەوە !

«سیگمۆند»ی پادشای مەجەر زەندەقی لەم ئاڵوگۆڕە خێرایانە چوو ، چونکە دەیزانی ئەم جارە نۆرەی خۆی دێت ! بەڵام ویستی وا پیشان بدات کە بە خۆیدا دەنازێت و لەکەس ناترسێت بۆیە وەفدێکی بۆ لای سوڵتان بایەزید نارد

ئەم وەفدە ئەوەی پێ سپێررا بوو کە یەک شت بە سوڵتان بڵێت

- ئایا بە چ «حەق» و چ «صەلاحییەت»ێک بولغاریاتان گرت ؟

سـوڵتان گوێی لە وەفدەکە ڕاگرت و ناسـکە زەردەخەنەیەکـی بۆ کردن و ، پاشان وتی :

- ئێستا پیشانتان دەدەم بە چ «حەق» و چ «صەلاحییەت»ێک بولغاریامان گرت

دوای ئەمە بە گوێی دەرگاوانەکەیدا چپاند و داوای لێ کرد موصحەفێکی بۆ بهێنێ

کە موصحەفەکەیان بۆ هێنا لە پێشدا ماچی کرد و ، ئنجا گرتی بە دەستی ڕاستیەوە پاشان شمشێرەکەشی ڕاکێشا و گرتی بە دەستی چەپیەوە و ، ڕووی لە وەفدەکە کرد و ، بە دەستی ڕاست موصحەفەکەی بەرز کردەوە و وتی

- بەم حەقە بەم موصحەفە ئەی کاکی سەفیر !

پاشان بە دەستی چەپیشی شمشێرەکەی بەرز کردەوە و وتی

- بەم صەلاحییەتەش بەم شمشێرە ئەی کاکی سەفیر !

یەکسەر وەفدەکە بە سەری نەوی لە کۆڕەکە چوونە دەرەوە و گەڕانەوە بۆ لای پادشاکەیان !

* * *

# ئەو پادشایەی کە شایەتیی وەرنەگیرا

ئێمە ئێستا لە شاری «بوورسە» و لە سەردەمی سوڵتان بایەزیدی عوسمانیداین کە بە «هەورە برووسکە» بەناوبانگە و ، فاتیحێکی هێندە مەزنە کە ولاتانی وەک «بولغار و بۆسنە و سولانیک و ئەلبانیا»ی فەتح کردووە ئەو پادشایەی کە سەرکەوتنێکی گرنگ و سەرسوورهێنی بەسەر سوپای خاچپەرستەکاندا تۆمار کرد کە سوپایەک بوو «پاپا بۆنیگا جیووسی چوارەم» کۆی کردبووەوە بۆ دەرکردنی موسڵمانان لە ئەورووپا و سوپایەک بوو پازدە دەوڵەتی ئەورووپایی وەک «ئینگلتەرا و فەرەنسا و مەجەر» بەشدارییان تێدا کردبوو ، ئەمەش لە جەنگی «نیگبولی»ی خوێناوی و مێژوویی و بەناوبانگدا کە لە ساڵی ۱۳۹٦زدا ڕوویدا.

ئەم پادشا فاتیحەی کە ئەم فتووحاتەی ئەنجام داوە ڕۆژێکیان لە دادگا داوا کرا بۆ شایەتیدان لە کێشەیەکدا لەبەردەم قازی و زانای بەناوبانگ «شمس‌الدینی فەناری»دا

سوڵتان ڕۆشتە ناو دادگا و لەبەردەم قازیدا ، وەک هەر شایەتێکی تری ئاسایی ، ڕاوەستا و دەستەکانی لە بەردەمیەوە هەڵپێکا

قازی سەری بۆلای سوڵتان بەرز کردەوە و ، بە توورەییەوە بۆی ڕوانی ، ئنجا پێی وت

– شایەتیی تۆ قبوڵ ناکرێ! چونکە نوێژەکانت بە جەماعەت ناکەیت. خۆ هەرکەسێکیش بێ هیچ عوزر و بەهانەیەکی شەرعی نوێژەکانی بە جەماعەت نەکات ، دەگونجێ لە شایەتیدانەکەیدا درۆ بکات!

ئەم وشـانە ، وەک هەورە برووسـکە ، داباریـن بەسـەر ئامادەبووانی دادگادا! چونکە تۆمەتەکە گەلێ گەورە بوو تەنانەت سووکایەتی کردنیش بوو بە سوڵتان «بایەزید»! بۆیە هەرهەموویان لە جێی خۆیاندا

وەک بڵێی بە زەوی‌دا چەقێنرابوون چرکەیان لێوە نەدەهات و هەناسەیان لە خۆیان بڕیبوو، چاوەڕوانی ئەوە بوون کە تەنها بە ئاماژەکردنێکی سوڵتان ملی قازی بپەڕێنرێ !

بەڵام سوڵتان هیچ شتێکی نەوت بەڵکو بەوپەڕی هێمنی و ئارامی‌یەوە ڕووی خۆی وەرچەرخاند و ڕۆشتە دەرەوەی دادگا

هەر لەو ڕۆژەدا سوڵتان فەرمانی دەرکرد مزگەوتێکی لە تەنیشتی کۆشکەکەی خۆیەوە بۆ بنیات بنێن ئیتر دوای ئەوە کە مزگەوت تەواو بوو هەموو نوێژەکانی تێدا بە جەماعەت جێ‌بەجێ دەکرد

ئەم ڕووداوە پێش سەدان ساڵ مێژوونووسی تورک «عوسمان نزار» لە کتێبی «حديقة السلاطين»دا تۆماری کردووە

جا کاتێ کە موسڵمانان زانای وەک ئەو زانایانەیان هەبوو ، پادشای ئاوا حوکمڕانیی دەکردن !

* * *

# صەمموونچی بابا

ئەمە بەسەرهاتی یەکێکە لە ئەولیایانی خوای گەورە  کە ناوی «حامد ئاقسەرایلی»یە ، بەڵام لەناو خەڵکی شاری «بوورسە»دا بە «صەمموونچی بابا» ناسراو بووە ، چونکە صەمموونی پێ دەفرۆشتن.

ئەو پیاوچاکە لە شاری «قەیسەری» لە دایک بووە و بۆ خوێندن ڕۆشتووەتە شام و تەوریز و لەوێشەوە گەیشتووەتە «ئەردەبیل» کە دەکەوێتە باکووری خۆرئاوای ئێران و ، بە کتێبخانە گەورەکەی بەناوبانگ بووە ، سەردەمێک ئەوپەڕی بووژانەوەی ڕۆشنبیریی بە خۆیەوە دیوە

لەم شارەدا پەیوەندیی بە زانای گەورە و پیاوچاکی خواناس «علاءالدین الأردبیلي»یەوە کردووە و  چەند ساڵێک لە خزمەتیدا ماوەتەوە و ، لە زانیاری‌یەکانی ئەو بەهرەمەند بووە ، هەروەک ڕێبازی تەسەووفیشی هەر لەو وەرگرتووە

پاشان کە گەڕاوەتەوە ، لە شاری «بوورسە» نیشتەجێ بووە ، کە ئەو دەمە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی و ڕێکەوتی حوکمڕانیی سوڵتان بایەزیدی یەکەم بووە ، کە دەکەوێتە نێوان ساڵەکانی (١٣٦٠-١٤٠٣ز).

«صەمموونچی بابا» چەند ساڵێکی تەمەنی لە شاری «بوورسە»دا بە صەمموونفرۆشی بردەسەر  ئەوەبوو فڕنێکی خنجیلانەی لە ماڵەکەی خۆی‌دا هەبوو صەمموونی تێدا دروست دەکرد و پاشان دەیخستنە ناو زەمیلەیەکی گەورە و ئنجا زەمیلەکەی دەدا بە کۆڵی‌دا و کۆڵانەکانی پێوە دەگەڕا  هەر کە منالانیش دەیان‌بینی ، یەکسەر دەیانوت

- صەمموونچی بابا هات  صەمموونچی بابا هات !

ئیتر لێی کۆ دەبوونەوە و صەمموونیان لێ دەکڕی  هەموو منال و گەورە و خەڵکی شاری «بوورسە» خۆشیان دەویست ، چونکە ڕوویەکی گەشی نوورانیی پێوە بوو ، هەروەک ئەویش منالانی خۆش دەویست و بە

قسەی خۆش دەیدواندن ، جگە لەوەی کە نانەکەی گەرم و گوڕ و خاوێن و بەلەزەت بوو

کاتێک سولتان بایەزید دەستی کرد بە دروست کردنی مزگەوتی «ئولو جامیع» واتە مزگەوتی گەورە ، کرێکارەکان صەموونیان لەو دەکڕی.

ئەم مزگەوتە یەکێکە لە کارە ناوازەکانی هونەری بیناسازیی ئیسلامی و ، ئەو ئایەتە پیرۆزانەش کە مزگەوتەکەیان پێ ڕازاوەتەوە کارێکی ناوازەیە لە هونەری خۆشنووسیدا

کاتێ مزگەوتەکە تەواو بوو بڕیار درا بە نوێژی جومعە «إفتتاح» بکرێت

لە ڕۆژی جومعەدا سولتان بایەزیدی یەکەم لەگەڵ وەزیرەکانی و فەرماندەکانی سوپا و زانایان و حەشاماتێکی زۆری خەڵکی شاری «بوورسە»دا هاتن بۆ ئەوێ بۆ نوێژکردن ، تەنانەت ناو مزگەوتەکە - بەو گەورەییەشەوە - هێشتا جێی ئەو حەشاماتەی تێدا نەدەبووەوە .

هەر کە وەختی وتنی وتاری جومعە هاتە پێشەوە ، سولتان ئاوڕی بۆ لای زانای مەزن «ئەمیر سولتان» دایەوە و داوای لێ کرد وتارەکەیان بۆ بلێت

«ئەمیر سولتان»یش ڕۆشتە لای مینبەرەکە و لەوێ ڕاوەستا و چاوی بەناو ئامادەبوواندا دەگێڕا ، وەک بلێی بە دوای کەسێکدا بگەڕێ بەلێ چاوی بۆ «صەموونچی بابا» دەگێڕا ! چونکە هەر تەنها ئەم نرخی زانست و ڕێزی ئەوی دەزانی ، هەرچەندەش خەڵکی شار ئەم لایەنەی صەموونچی بابایان نەدەزانی و لێی بێ ئاگا بوون و پێیان وابوو کە تەنها پیاوێکی باشی صەموونفرۆشە

لە دواییدا بەرچاوی کەوت ئنجا دەستی بۆ ڕاکێشا و بە دەنگێکی بەرزی ئەوتۆ کە هەموو دانیشتووان بیستیان ، وتی

- کەس نی یە لەم مزگەوتەدا لەم پیاوە شایانتر بێ بۆ وتنی وتاری ئەم جومعەیە !

هەموو دانیشتوان لەم قسەیە سڵەمینەوە و ئاوڕیان بۆ ئەو لایە دایەوە کە زانای مەزن «ئەمیر سوڵتان» ئاماژەی بۆ کرد

صەمموونچی بابایش هەستی بە تووش بوون و گیرۆدەیی‌یەکی زۆر کرد ، چونکە بە درێژایی ئەو ساڵانەی پێشوو ، خۆی لای خەڵکی ئاشکرا نەکردووە و خەڵکی شار هەر هێندەی لەبارەوە دەزانن کە صەموون‌فرۆشە ، کەچی وا «ئەمیر سوڵتان» لە بەرچاوی خەڵکی‌دا ئەو نهێنی‌یەی ئاشکرا کرد !

ناچار لە جێی خۆی هەڵسا و بەرەو مینبەرەکە کەوتە ڕێ و ئەو حەشاماتەش چاویان تێ بڕیبوو

پێش ئەوەی سەربکەوێتە سەر مینبەرەکە سەری لە گوێی «ئەمیر سوڵتان» نزیک کردەوە و بە ئەسپایی و گلەیی لێکردنەوە پێی‌وت

– چیت کرد برای بەڕێزم ! لای خەڵک دەرت‌خستم !

ئەمیر سوڵتانیش بە چپە وەڵامی دایەوە

– برای ئازیزم ! تۆ لە هەموو کەسێ شایان‌تری بۆ وتنی ئەم خوطبەیە

ئنجا صەموونچی بابا سەرکەوتە سەر مینبەر و پاش حەمد و سەنای خوای گەورە سوورەتی «فاتحة»ی خوێند و دوای ئەوە لە «حەوت» ڕووەوە بۆی تەفسیر کردن ! وتارەکەی هێندە ناوازە و ڕەنگین بوو کە سەرنجی دڵ و دەروونی هەموو ئامادەبووانی ڕاکێشا بوو

زانای گەورە و بەناوبانگ «مەلا فەناری» کە یەکێک بووە لە ئامادەبووان سەرسامی و سەرسووڕمانی خۆی لەو خوطبەیە نەشاردووەتەوە ، لە دوایی‌دا لای هاوەڵەکانی خۆی وتبووی :

– بە چاوی خۆمان مەزنیی ئەم پیاوەمان بینی کە چۆن وەک مەلەوان لە دەریای زانست و تەفسیردا مەلەی دەکرد چونکە تەفسیری یەکەم هەموو دانیشتووان لێی تێ‌گەیشتن هی دووەهەم هەندێک لە دانیشتووان لێی تێگەیشتن تەفسیری سێ‌هەم کەسانێکی زۆر کەم

توانییان لێی تێبگەن .. بەلام هی چوارەم و پێنجەم و شەشەم و حەوتەم لە سەرووی توانای تێگەیشتنی هەموومانەوە بوون !

ئەم هەواڵە لە هەموو لایەکی «بوورسە»ی پایتەختدا بلاو بووەوە و ، حەقیقەتی ئەم پیاوە هەژارە خاکی‌یە لای خەڵکی ئاشکرا بوو که زەمیلەی نان و صەموون دەخاتە سەر شانی و کۆڵان و بازارەکانی پێوە دەگەڕێ و منالان بە قسەی خۆش دەدوێنێ .. بەڵێ ، زانییان ئەم پیاوە زانایەکی پایەدارە و یەکێکە لە ئەولیایانی خوای گەورە .

ئیتر چاویان بۆ دەگێڕا تاکو دەستەکانی ماچ بکەن و داوای دوعای خێری لێ بکەن بەلام پاش ئەو جومعەیە کەسیان نەیان‌بینی‌یەوە چونکە دوای ئەوەی لای خەڵکی ئاشکرا بوو شاری «بوورسە»ی بەجێ‌هێشت و چوو بۆ شارێکی تر کە هیچ کەسێک لەوێ نەی‌ناسێت !

دوایی لە شاری «ئاق سەرای» کۆچی دوایی کرد و هەر لەوێش نێژرا.

خوای گەورە لێی خۆش بێ .

* * *

# سوڵتان موورادی دووهەم

*چەند زانیاری‌یەکی مێژوویی لە بارەیەوە*

ناوی باوکی   سوڵتان محمدی یەکەم .

ناوی دایکی   ئەمینە خاتوون .

ساڵی لە دایکبوونی   ١٤٠٣ز

ساڵی چوونە سەر تەختی   ١٤٢١ز

وازهێنانی لە پادشایی   ١٤٤٤ز

چوونەوە سەر تەختی بۆ جاری دووهەم   ١٤٤٥ز

کۆچی دوایی   ١٤٥١ز

گرنگترینی کارە جەنگی‌یەکانی

* هێرش بردنی بۆ سەر «ئەفلاک و ئەلبانیا و دوورگەی مواری»و سەرکەوتنی لە هەموویاندا .

* فەتحی سولانیک .

* سەرکەوتنی بەسەر ڤینیسی‌یەکاندا لە جەنگی «گالیبۆلی» .

* دەست بەسەرداگرتنی چەند میرنشینێکی وەک مەنتشە و تەکەو، خستنیان بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی .

* ئابڵووقەدانی بولگراد .

* سەرکەوتنی بەسەر سوپای خاچ پەرستاندا لە جەنگی «وارنا»دا.

* سەرکەوتنی لە جەنگی «قوصوە»ی دووهەمدا بەسەر سوپای خاچ‌پەرستاندا .

* * *

# وەفدی گاورەکان
# بۆ لای سوڵتان مورادی دووهەم

دوای ئەوەی کە سوڵتان بایەزیدی یەکەم (١٣٦٠-١٤٠٣ز) لە جەنگی «ئەنقەرە»دا لە بەرامبەر دوژمنە سەرسەختەکەیەوە کە «تەیموری لەنگ» بوو شکستی هێنا و بە دیل گیرا ، ناوچەی ئەنادۆڵ سەردەمێکی پڕ لە ئاشووب و شڵەژاوی بە خۆیەوە بینی و ، میرەکانی ڤینیسیا ئەم هەلەیان قۆزتەوە و دەستیان بەسەر شاری «سولانیک»دا گرت ..

هەروەک زانراوە ئەم سەردەمە شڵەژاوە ، هەر بەردەوام بووە تا یەکێک لە کوڕانی سوڵتان بایەزیدی یەکەم (واتە سوڵتان محمدی یەکەم ١٢٨٩-١٤١٢ز) توانیی بەسەر ئەو پارچە پارچەیی‌یەدا سەربکەوێت و ئەو میرنشینانەش نەهێڵێ کە لە ئەنادۆڵدا دروست ببوون و توانیی دەوڵەت لە ژێر سایەی یەک ئاڵادا یەک بخاتەوە

سوڵتان محمدی یەکەم لەبەر ئەوەی سەرگەرمی کارێکی گەلێ گەورە بوو ، کە یەکخستنەوە و دامەزراندنەوەی سەرلەنوێی دەوڵەت بوو ، ئەوا بۆی نەلوا «سولانیک» لە دەستی داگیرکەران بسێنێتەوە

بەڵام کوڕەکەی (واتە سوڵتان مورادی دووهەم) کە دوای خۆی هاتە سەر حوکم ، هەر «سولانیک»ی لە یاددا بوو بەڵام ویستی بە ڕێگای هێمنی و شێوازی لەسەرخۆ بیخاتەوە ژێر دەستی دەوڵەت ئەوەبوو لە پێش‌دا چەندین دیاریی بۆ کاربەدەستانی ڤینیسیا نارد و داوای لێ کردن شارەکە چۆڵ بکەن و تەسلیمی بکەنەوە کاربەدەستانی ڤینیسیاش چەند جارێک وەفدیان نارد بۆ لای سوڵتان تاکو دەست‌خەڕۆی بکەن و سوود لە بەسەربردنی کات وەربگرن بەڵام کاتێ کە سوڵتان ئارامی لا نەما ، بە دواهەمین وەفدی ئەوانی وت

- یەکێ لە باپیرانمان «سـولانیک»ی فەتح کردووە (١) و ، ئیتر لەو ڕۆژەوە ئەو شارە شارێکی ئیسلامی‌یە لەبەر ئەوە ، هەرگیز ناتوانین بە حوکمڕانی و ڕۆشبـتنە ناوەوەی هیچ حوکمێکی بیانی لەو شـارەدا ڕازی ببین. جا ئەگەر بە سەربەستیی خۆتان و بە خۆشی ئەو شارە چۆڵ نەکەن ، ئەوا خۆم دێم و بە زۆر دەرتان دەکەم !

سوڵتان چەند مانگێک چاوەڕوانیی کرد بەلاَم دوای ئەوەی کە هیچ وەلاَمێکی بۆ نەهات ، هەڵمەتێکی دەریایی لە ساڵی ١٤٣١زدا خستە ڕێ‌و لە نزیکی «گالیبۆلی» لەگەڵ هێزی دەریایی ڤینیسی‌یەکان‌دا پێکداهاتن و شکستێکی گەورەی بەسەردا هێنان پاشان گەیشتە «سولانیک» و لە پێش‌دا ئابلۆقەی دا ، پاشان هێرشی بۆ کرد و ، دوای جەنگێکی سەخت توانیی بە سەرکەوتوویی بڕواتە ناو شارەوە !

* * *

لەم ماوەیەدا کە سوڵتان موراد لە شاری «سولانیک»دا بوو هەواڵیان بۆ هێنا کە وەفدێک لە شاری «یانیا»وە هاتووە و تکا دەکەن کە چاویان بە سوڵتان بکەوێ !

سوڵتان سەری لەم هەواڵە سووڕما ! چونکە هیچ پەیوەندی‌یەکی بەم شارەوە نەبوو لەبەر ئەوەی ئەو شارە لە ژێر دەستی حوکمڕانیی «ئیتالیا»دا بوو

جا بۆ ئەوەی خوێنەری بەڕێز سەبارەت بەم شارەوە هەندێ زانیاریی مێژوویی بزانێت ، وا لە خوارەوەدا بە کورتی چەردەیەکی لەم بارەیەوە بو باس دەکەین

شاری «یانیا» لە ژێر حوکمی بنەماڵەی «تۆکۆ Tocco»ی یتالی‌دا بوو کاتێ «کارلۆ تۆکۆی یەکەم» لە ساڵی ١٤٣٠زدا مرد برازاکەی کە ناوی «کارلۆ تۆکۆ دووهەم» بوو دوای ئەو جڵەوی

(١) یەکەم پادشای عوسمانی کە «سولانیک»ی ڤەتح کرد سوڵتان مورادی یەکەم بوو ، ساڵی ١٣٧٤ز .(دانەر)

حوکمڕانیی گرتە دەست بەڵام کوڕە ناشەرعیەکانی تۆکۆزی یەکەم دەستیان دایە شۆڕشکردن لە دژی و داوای حوکمڕانییان بۆ خۆیان دەکرد . بەم جۆرە سەردەمێکی پڕ لە جەنگ و ئاشووب دەستی پێ کرد کە میللەت پێوەی گیرۆدە بوبوو جا کاتێ بیستیان «سوڵتان موورادی دووهەم» نزیکیان بووەتەوە و لە شاری «سولانیک»دایە ، بڕیاریان دا وەفدێک لە بریی خەڵکی شار بنێرنە لای

سوڵتان فەرمانی دا ڕێ بە هاتنەژوورەوەی وەفدەکە بدرێت پاشان لە ڕێی تەرجومانەوە لە سەرۆکی وەفدەکەی پرسی

– بەخێربێن چی هانی دان بێن بۆ ئێرە و داواکاریتان چی‌یە ؟

سەرۆکی وەفدەکە وتی

– ئەی سوڵتانی بەڕێز ا هاتووین داوای یارمەتیت لێ دەکەین تکامان وایە نائومێدمان نەکەیت ا

– جا من چۆن بتوانم یارمەتیتان بدەم ؟

– گەورەم ا میرەکانمان ستەممان لێ دەکەن و ، بە وێنەی کۆیلە دەمانخەنە کار و سامانمان زەوت دەکەن و پاشان بەرەو جەنگیش دەماندەنەبەر ا

– ئایا من چیم پێ دەکرێ بۆتان بکەم ؟ ئەمە کێشەی نێوان خۆتان و میرەکانتانە !

– ئەی سوڵتانی بەڕێز ا ئێمە موسڵمان نین ، بەڵکو گاورین بەڵام زۆرمان لەبارەی دادگەریی موسڵمانانەوە بیستووە و دەزانین کە چۆن ئێوە ستەم لە میللەت ناکەن و زۆریش لە کەس ناکەن کە ببێ بە موسڵمان و ، هەموو خاوەن مافێکیش مافی ڕەوای خۆی دەدرێتێ ئەم هەواڵانەشمان لە ڕێی گەشتیاران و ئەو بازرگانانەوە بەرگوێ کەوتووە کە سەردانی وڵاتی ئێوەیان کردووە جا ئێمە هاتووین کە تکاتان لێ بکەین ئێمەش بخەنە ژێر سۆز و چاودێریی خۆتان و ، حوکمی شارەکەمان بگرنە دەست و لە حوکمڕانە ستەمکارەکانی خۆمان ڕزگارمان بکەن !!

ئنجا كليلى زێرینی شارەکەشیان پێکەشی سوڵتان کرد !

سوڵتانیش بە دەم هانا و تکای خەڵکی شاری «یانیا»وە ڕۆشت و ، یەکێک لە فەرماندەکانی خۆی بەسەرکردەیی سوپایەکەوە نارد و لە هەمان ساڵدا ، واتە لە ساڵی ١٤٣١زدا ، ئەو شارەی فەتح کرد

ئەم چیرۆکە هەرچەند سەیر و نامۆیە بەڵام چیرۆکێکی ئەندێشەیی نی‌یە

بەڵکو ڕاستی‌یەکی مێژوویی‌یە

چونکە موسڵمانان لە مێژوودا ڕەمزی «دادگەری» و «ویژدان» بوون.

* * *

# وەلی و سولتان

سـولتان مورادی دووهەم که باوکی سـولتان «محمد فاتیح»ە ، «حاجی بەیرام»ی وەلی و پیاوچاکی گەلێ خۆش دەویست و ڕێزی لێ دەگرت ، چونکه ئەم مرۆڤە یەکێک بوو لە زاهید و صۆفی و زانا هەرە مەزنەکانی سەردەمی خۆی . تەنانەت هێندەی خۆش دەویست که فەرمانی دەرکردبوو : «باج» وەرنەگیرێت لە موریدەکانی ئەم وەلی‌یەی که لە «ئەنقەرە» دادەنیشت ، که ئەو کاتە شارۆچکەیەکی بچووک بووە

بەلاّم هەر ئەوەندە ئەم هەواڵە لە ناو خەڵکی ئەنقەرەدا بلاّوبووەوە واتە هەواڵی باج نەسەندن لە موریدانی ئەم شێخە)یەکسەر هەموو خەڵکەکە ئیددیعای ئەوەیان کرد که موریدی ئەم وەلی‌یەن ! ئەم کارەش کارمەندەکانی فەرمانگەی باجوەرگرتنی دووچاری سەرسامی و گیروگرفت کردبوو !

کەواتە چار چی‌یە ؟ ئایا دەچێتە عەقڵەوە که هەموو خەڵکی شار موریدی ئەو بن ؟ یان ئایا چۆن ڕاستگۆیان جیا بکرێنەوە لەوانەی که بە درۆ ئەم لافە لێدەدەن ؟ تەنها یەک چارەسەرییان لە دەستدا بوو ، ئەویش بریتی بوو لەوەی بڕۆنە لای خودی سولتان و لەم بەسەرهاتە ئاگاداری بکەنەوە و بزانن فەرمانی بەچی‌یە ؟

بەڕێوەبەری باجوەرگرتن داوای چاوپێکەوتنی سولتانی کرد کاتێ که ئیزن درا ، چووە ژوورەوە و بە سولتانی وت

– گەورەم ! ئێمە ناتوانین باج لە خەڵکی ئەنقەرە وەربگرین .

– لەبەر چی ؟ ئایا مل نادەن بۆ باجدان ؟

– نەخێر گەورەم! جەنابت فەرمانت دەرکردووە که باج لە موریدەکانی ئەم وەلی‌یە (حاجی بەیرام) وەرنەگیرێت

– بەڵێ ڕاستە بەلاّم ئەمە چ پەیوەندی‌یەکی بەم بابەتەوە هەیە که تۆ باسی دەکەیت ؟

- گەورەم ! هەموو خەڵکی ئەنقەرە ئیددیعای ئەوە دەکەن کە موریدی ئەم وەلی‌یەن !

- هەرهەموویان ؟

- بەڵێ گەورەم هەرهەموویان !

- جا ئایا باوەڕتان پێ‌کردن ؟

- نەخێر گەورەم !.. بەلاّم ئایا چۆن بتوانین ڕاستگۆیان لەوانی تر جیا بکەینەوە ؟

- ڕاستە ئەمە کارێکی سەختە وا من نامە بۆ حاجی بەیرام دەنێرم و لێی دەپرسم ژمارەی موریدەکانت چەندەیە ؟

سوڵتان موڕادی دووهەم نامەیەکی بە یەکێک لە پیاوانی‌دا نارد بۆ ئەنقەرە بۆ لای حاجی بەیرام

حاجی بەیرام نامەکەی سوڵتانی خوێندەوە و پاشان ئاوڕی بۆ لای یەکێ لە موریدەکانی دایەوە و وتی

- دەمەوێ هەفتەی داهاتوو هەموو موریدەکان لە مەیدانی گەورەدا کۆببنەوە و کەس دوانەکەوێ ئنجا ڕۆژ و کاتی کۆبوونەوەکەشی دەست‌نیشان کرد

موریدەکەش ئەم ڕاسپاردەیەی شێخی بە موریدەکان گەیاند

لە ڕۆژ و شوێنی دیاری کراودا نزیکەی هەموو خەڵکی ئەنقەر کۆبــوونەوە ! گۆڕەپـانەکەش تەنها یەک خـێوەت لە ناوەڕاســتی‌دا هەڵدرابوو ..

حاجی بەیرام لە خێوەتەکەی هاتە دەرەوەو ڕووی کردە ئەو حەشاماتەی کە بە تاسەوە هاتبوون بزانن هۆی ئەم کۆبوونەوەیە چی‌یە ؟ ئنجا پێی وتن :

- هەرکەسێک موریدی منە و من بە شێخی خۆی دادەنێ ، با بێتە پێشەوە و بڕواتە ناو خێوەتەکە ، چونکە من لە پێناوی خوای گەورەدا دەیکەم بە قوربانی و خوێنەکەی دەڕێژمە دەرەوەی خێوەتەکە !

لەم کاتەدا لاوێک لە موریدەکانی هاتە پێشەوە و وتی

- شێخم ! من ئامادەم

حاجی بەیرام ئەم لاوەی بردە ژوورەوە و لەوێ فەرمانی دا مەڕێک سەر ببڕن و خوێنەکەی بچێتە دەرەوەی خێوەتەکە ، تاکو خەڵکی ببینن !

خەڵکەکە لە سەرسامیدا زمانیان گۆی نەدەکرد ! چونکە لەو باوەڕەدا بوون کە حاجی بەیرام لاوەکەی سەربڕیوە و خوێنەکەی ڕشتووە !

پاشان شێخ لە خێوەتەکە هاتە دەرەوە و هەمان داواکاریی پێشووی دووپات کردەوە

- کێی تر هەیە ؟ موریدێکی ترم دەوێ

لاوێکی تر لە موریدە دڵسۆزەکانی هاتە پێشەوە و وتی

- شێخم ! منیش ئامادەم

شێخ ئەمیشی وەک ئەو بردە ژوورەوە و هەمان ڕووداوی پێشوو ڕووی دایەوە

وردە وردە خەڵکەکە دەڕۆشتن و مەیدانەکەیان بەجێ دەهێشت !

ئنجا وتی

- ئایا موریدێکی تر هەیە ؟

یەکێ لە ئافرەتە ئامادەبووەکان هات و وتی

- بەڵێ شێخم ! من ئامادەم

بەڵام لە چوارەم جاردا هەموو بێدەنگ و کش و مات مانەوە و کەس نەهاتە پێشەوە ! چونکە هەموو چاویان بڕیبووە پەڵە خوێنەکانی دەرەوەی خێوەتەکە !

هەر ئەو ڕۆژە «حاجی بەیرام» وەڵامی نامەکەی سوڵتان مورادی دووهەمی دایەوە و ، بۆی نووسی :

ژمارەی موریدەکانم لە «ئەنقەرە»دا سێ کەسە دوو پیاو لەگەڵ ئافرەتێکدا !!

* * *

# سوڵتان محمدی دووهەم (فاتیح)

*چەند زانیاری‌یەکی مێژوویی لەبارەیەوە*

ناوی   سوڵتان محمدی دووهەم

نازناوی : فاتیح

ناوی باوکی سوڵتان مورادی دووهەم

ناوی دایکی   هوما خاتوون .

بەرواری لەدایکبوونی   ٢٩-١٤٣٢/٣/٣٠ز

بەرواری چوونە سەرتەختی یەکەم جاری   ١٤٤٤ز

بەرواری چوونە سەرتەختی دووهەم جاری   ١٤٥١ز

بەرواری کۆچی دوایی : ١٤٨١/٥/٣ز

سوڵتان مورادی دووهەم ، کە باوکی محمد فاتیحە ، ویستی لێ ببڕێ بۆ خواپەرستی ، بۆیە وازی لە کورسیی حوکمڕانی هێنا بۆ محمدی کوڕی کە هێشتا تەمەنی دوازدە ساڵان بوو !

کاتێ دەوڵەتەکانی ئەورووپا ئەم هەواڵەیان بیست ، ئاوات و هیوای دەرکردنی موسوڵمانان لە ئەورووپا لە دڵیاندا بووژایەوە ، چونکە ئەوەیان لێک دایەوە کە حوکمی عوسمانی‌یەکان کەوتووەتە دەستی منداڵێک ! بۆیە هەڵمەتێکی خاچپەرستانەی گەورەیان ڕێکخست کە «ئەڵمانیا و ئیتالیا و مەجەر و بۆلۆنیا و چیکوسلۆفاکیا» بەشدارییان تێدا کردبوو محمدی دووهەم لە بەردەم ئەم هێرشە مەزنەی خاچپەرستاندا ناچار بوو کە داوا لە باوکی بکات سەرکردەیی سوپای ئیسلام بگرێتە ئەستۆ و ڕووبەرووی دوژمن ڕابووەستێ   باوکیشی هات بەدەمیەوە و سەرکردەیی جەنگەکەی گرتە ئەستۆ و سەرکەوتنێکی تێدا بەدەست هێنا   دوای ئەم

جەنگەش هەر لە حوکمدا مایەوە تا کۆچی دوایی لە ساڵی ١٤٥١زدا ئنجا محمدی کوڕی هاتەوە سەرتەخت .

گرنگترین کارە جەنگی‌یەکانی «محمد فاتیح»

* فەتحی «قوستەنتینییە» (واتە ئەستەمبووڵ) هەر لەبەر ئەوەش نازناوی «فاتیح»ی لیٚ نراوە

* فەتحی «صرب و ئەثینا و ئیمپراتۆریتیی تەرابزۆن و مەدەللی و بۆسنە و قۆنیە و ئالانیا و دەوروبەری سیلیفکا»

* هێرشی دەست پیٚ کرد بۆ سەر دەوروبەری ئیتالیا و ، «ئۆترانتۆ»ی فەتح کرد و ، ئابلۆقەی «ڕۆدس»ی دا

* دەستی بەسەر چەند میرنشینێکی تورکدا گرت و خستنیە سەر دەوڵەتی عوسمانی

* * *

# دەروێش و سوڵتان محمد فاتیح

ئاواتی دێرینەی موسڵمانان هاتەدی و بیزەنتی‌یەکان شکستیان هێنا و شاری «قوستەنتینییە» واتە «ئەستەمبوول» فەتح کرا

لەم کاتەدا مەوکیبی سوڵتان محمد فاتیح دەرکەوت کە لە لای «تۆپ قاپی»یەوە بە سواری ئەسپەکەی دەهاتە ناوشار و ، وەزیرەکان و زانایان و فەرماندە و سوارەکان دەورەیان دابوو

لەو دەمەدا هەزاران کەس لە خەڵکی شار پەنایان بردبووە بەر کەنیسەی «ئەیا سۆفیا» چونکە هەندێ لە پیاوانی ئایینەکەیان وای بردبووە وەهمیانەوە کە گوایا مەلائیکەتێک لە ئاسمان دادەبەزێت و موسڵمانەکان دەسووتێنێ و ، هەرگیز ئەو موسڵمانانە ناتوانن بگەنە لای کەنیسەی ئەیا سۆفیا چونکە ئەو مەلائیکەتەی کە دێت نایەڵێ موسڵمانەکان لەو شوێنە زیاتر بێنە پێشەوە کە ئێستا پێی دەوترێ «چامبەرلی تاش» و نزیکەی سێ‌سەد مەترێک لە کەنیسەکەوە دوورە !!

بەڵام پاشماوەی خەڵکەکە حەزیان دەکرد ئەم فاتیحە نوێ‌یە ببینن بۆیە لەمبەر و ئەوبەری درێژایی ڕێگای نێوان «تۆپ قاپی» و «ئەیا سۆفیا»دا ڕیزیان بەستبوو

کت‌وپڕ لەم کاتەدا یەکێک لە دەروێشەکانی ناو سوپای عوسمانی لەناو جەماوەرەکە دەرپەڕی و هاتە پێشەوە و یاڵی ئەسپەکەی سوڵتانی گرت و سوڵتان و سەرجەمی مەوکیبەکەی ڕاوەستاندو، بە سوڵتانی وت :

– لەبیرت نەچێ – ئەی سوڵتان ! – کە بە فەزڵی دوعا و نزای ئێمەی دەروێشەوە ئەم شارەت فەتح کرد !

سوڵتان محمد فاتیحیش ناسکە زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و ئنجا دەستی برد بۆ شمشێرەکەی و تا نیوەی لە کێلانەکەی هێنایە دەرەوە و پێی وت

– دەروێش ! ڕاست دەکەیت بەڵام تۆیش مافی ئەم شمشێرە لە یاد مەکە !

# سینان پاشا و سوڵتان محمد فاتیح

دوای تەواوبوونی فەتحی «ئەستەمبووڵ» سوڵتان محمد فاتیح چەند تەعلیماتێکی سەبارەت بە قەڵا و شووراکانی دەورووبەری شار دانا یەکێک لەوانە بریتی بوو لەوەی کە فەرمانی توند و تیژی دەرکردبوو بۆ داخستنی دەرگای قەڵاکانی ئەم شوورایانە لە دوای نوێژی شێوانەوە تا نوێژی بەیانی ئنجا چەند مەفرەزەیەکی زۆریشی بۆ جێبەجێ کردنی ئەم بڕیار و تەعلیماتە لەسەر قەڵاکان دانابوو بۆ مەبەستی ڕاگیرکردنی ئاسـایشـی ناوشـار بەم جۆرە لە نێوان ئەم دوو کاتەدا ڕێ بـە هاتنەژوورەوە و چوونەدەرەوەی هیچ کەسێک نەدەدرا

«سینان چەلەپی پاشا» سەرکردەی یەکێک لەم مەفرەزانە بوو بەسەر ئەو قەڵایەوە کە دەکەوێتە ناوچەی «ئۆن قەبانی»

ڕۆژێکیان سوڵتان محمد فاتیح لەگەڵ یاوەرەکانی لە گەشتێکی دەرەوەی شووراکانی ئەستەمبووڵدا بوون و ، درەنگانێک گەیشتەوە شار. بەڵام کاتێ کە ئەو گەیشتە لای دەرگای شووراکەی ناوچەی «ئۆن قەبانی» دەرگاکە داخرابوو ، چونکە ماوەیەک پێش گەیشتنی ئەم بانگی شێوان درابوو !

یەکێک لە پاسەوانەکانی سوڵتان ، بانگی لە سینان کرد و وتی

- سینان پاشا ! سینان پاشا ! دەرگاکە بکەرەوە

سینان پاشایش لەسەر قەڵاکەوە لە شوێنی خۆیدا هەڵسایە سەر پێ و سەیرێکی خوارەوەی کرد بەڵام لەبەر تاریکی نەیتوانی کەسیان بناسێتەوە ناچار دابەزییە خوارەوە و لە پشتی دەرگاکەوە پرسیی

- ئێوە کێن ؟

سوڵتان محمد فاتیح وتی

- سینان چەلەبی دەرگاکە بکەرەوە

ئەویش وتی

- ئێوە کێن ؟ بۆچی تا ئێستا دواکەوتوون ؟

سینان دەنگی سوڵتانی نەناسی‌یەوە و ، سوڵتانیش خۆی لێ ئاشکرا نەکرد ، بۆیە پێی وت :

- مەپرسە ئێمە کێین .. دەرگاکە بکەرەوە !

- چۆن ناپرسم ؟ ئەی فەرمانی سوڵتانتان نەبیستووە ؟ چۆن دەتوانم بەم درەنگانە دەرگا لە ئێوە بکەمەوە ؟ بڕۆن ئەم ناوە بە جێ بهێڵن ، یان تا بەیانی چاوەڕوانی بکەن ! من ناتوانم سەرپێچی لە فەرمانی سوڵتان بکەم .. ئایا دەتانەوێ بە هۆی ئێوەوە سوڵتان قسەم پێ بڵێ ؟

سوڵتان پێکەنی و پێی‌وت :

- نا نا سینان چەلەبی دڵنیابە سوڵتان قسەت پێ ناڵێ من بەڵێنت دەدەمێ

- تۆ کێیت تاکو بتوانی لای سوڵتان کەفالەتم بکەیت ؟ ناشێ خۆت بە سوڵتان بزانیت ؟

- بەڵێ سینان چەلەبی ! من سوڵتانم هێشتا هەر نامناسیتەوە ؟

سینان پاشا لەم قسەیە سڵەمی‌یەوە ! بۆیە خێرا بەدەم ورتە ورتەوە دەرگاکەی کردەوە و وتی

- گەورەم ! داوای لێبوردن دەکەم نەمناسین هەروەک چاوەڕوانی ئەوەشم نەدەکرد کە جەنابتان بە پێچەوانەی ئەو تەعلیماتانەوە ڕەفتار بکەن کە هەر خۆتان داتان‌ناوە !

سوڵتان لە دەرگاکەوە ڕۆشتە ژوورەوە ، پاشان لە ئەسپەکەی دابەزی و دەستی خستە سەرشانی «سینان پاشا» و پێی وت

- سینان پاشا ! تۆ عەسکەری‌یەکی تەواو لێهاتوویت گەلێ دڵشاد بووم بەم پابەند بوونەت بە تەعلیماتەکانمەوە لەبەر ئەوە ، داوای

چیم لێ دەکەیت بۆت جێبەجێ دەکەم !

سینان پاشا لەم قسەیەی سوڵتان حەپەسا چونکە وا هەموو دەرگایەکی داخراوی لە بەردەمدا کراوەتەوەو دەتوانێ داوای هەر بڕە پارەو هەر پلە و پایەیەک بکات ..

سوڵتان بە زەردەخەنەوە چاوەڕوانی وەڵامەکەی سینانی دەکرد وەڵامی سینانیش زۆری نەخایاند چونکە هیچ دوودڵ نەبوو لە وەڵامەکەیدا نە پارە و نە پوولی لە سوڵتان نەدەویست بۆیە بڕیاری دا داوای هێنانەدیی ئەو ئاواتەی لێ بکات کە ساڵەهای ساڵە خەونی پێوە دەبینی .. بۆیە پێی وت

- گەورەم ! تەنها یەک شتم لێت دەوێ دەمەوێ مزگەوتێک بە ناومەوە بنیات بنێیت !!

سوڵتان ئەم تکایەی لێ قبووڵ کرد و ، فەرمانی دا مزگەوتێک بە ناو « سینان پاشا »وە بنیات بنرێت .

ئەگەر سەردانی ئەستەمبووڵت بۆ ڕەخسا بپرسە ئەو مزگەوتە لە کوێیە و ، سەردانێکی ئەم مزگەوتە مێژوویی‌یە بکە کە ئێستا چیرۆکی بنیاتنانەکەیت بیست ئنجا دوای نوێژەکەت دوعایەکی خێریش بۆ گیانی «سینان پاشا» بکە !

* * *

# سوڵتان محمد فاتیح و مامۆستاکەی
# «مامۆستا ئاق شمس الدین»

سوڵتان محمد فاتیح گەلێ ڕێزی لە مامۆستاکەی خۆی دەنا کە ناوی «ئاق شمس الدین» بوو هەروەک گەلێ خۆشی دەویست و بەردەوام سەردانی دەکرد و سوودی لە زانستە زۆرەکەی وەردەگرت و گوێ بیستی ئامۆژگاری‌یەکانی دەبوو

ئەم مامۆستایەشی گەلێ بە هەیبەت بوو ؛ جگە لە خوا سڵی لە کەس نەدەکردەوە و لە هیچ شتێک نەدەترسا . بۆیە هەرکات سوڵتان محمد فاتیح بهاتایە بۆ خزمەتی ئەم لەبەری هەڵنەدەسایەوە کەچی گەر ئەو سەردانی محمد فاتیحی بکردایە سوڵتان بەوپەڕی ڕێزلێنانەوە لەبەری هەڵدەسا و لە تەنیشتی خۆیەوە دای‌دەنا !

وەزیران و نزیکانی دەوروبەری سوڵتان هەستیان بەم دیاردەیە کرد بۆیە صەدری ئەعزەم (سەرۆک وەزیران) «محمود پاشا» ئەم سەرسوورمانەی خۆی لای سوڵتان دەربڕی و پێی‌وت

- سوڵتانی گەورەم ! نازانم بۆچی کە «ئاق شمس الدین» سەردانت دەکات لەبەری هەڵدەستیت ، بە پێچەوانەی هاتنی زانایانی تر کەچی کاتێ کە تۆ دەڕۆیتە سەردانی ، ئەو ڕێزەت لێ نانێتەوە و لەبەرت هەڵناسێتەوە ؟

سوڵتان وەڵامی دایەوە

- خۆیشم هۆی ئەمە نازانم .. بەڵام هەر کە دەیبینم بەرەوڕووم دێت ، دەستەڵاتم بەسەر خۆمدا نامێنێت و ناتوانم لەبەری هەڵنەسم بەڵام زاناکانی تر وا نین ، چونکە دەبینم لەبەردەممدا دەلەرزن و کە قسەشم لەگەڵ دەکەن زمانیان تەتەڵە دەکات کەچی کاتێ کە من قسە لە گەڵ «ئاق شمس الدین»دا دەکەم ، زمانم تەتەڵە دەکات !

* * *

# دادگەریی دادگا

«سوڵتان محمد فاتیح» فەرمانی دابوو مزگەوتێک لە ئەستەمبوڵدا دروست بکرێت و ، ئەرکی سەرپەرشتی کردنیشی بە «ئیبسلانتی» سپاردبوو ، کە ئەندازیارێکی «ڕۆم» بوو

یەکێ لە فەرمانەکانی سوڵتان بریتی بوو لەوەی کە ستوونەکانی ئەم مزگەوتە لە مەڕمەڕ بێت و ئەم ستوونانەش بەرز بێت تاکو مزگەوتەکە بە گەورەیی دەربکەوێ تەنانەت ئەندازەی بەرزیی ستوونەکانیشی بۆ ئەندازیارەکە دەست نیشان کردبوو

بەڵام ئەم ئەندازیارە ڕۆمی‌یە ، لەبەر هەر هۆیەک بوویێ و بێ ئەوەی سوڵتان ئاگادار بکاتەوە یان پرس و ڕای پێ بکات ، فەرمانی دابوو یەکێ لەو ستوونانە کورت بکرێنەوە و لێی ببڕرێ !

کاتێ سوڵتان «محمد فاتیح» ئەم هەواڵەی بیست گەلێ تووڕە بوو.. چونکە لە شوێنێکی دوورەوە هێنرابوون و پێی وا بوو تازە سوودیان لێ وەرناگیرێت. جا لە گەرماوگەرمی تووڕەبوونەکەی‌دا فەرمانی دەرکرد کە دەستی ئەو ئەندازیارە ببڕن ! خۆ هەرچەندەش دوایی لە فەرمانەکەی پەشیمان بووەوە ، بەڵام پەشیمانی‌یەکەی بێ سوود بوو چونکە دەستی ئەندازیارەکەیان بڕیبوو !

ئەم ئەندازیارەش بەرامبەر بەم ستەمەی کە لێی کرا بێ‌دەنگ نەبوو بەڵکو ڕۆشت بۆ لای قازیی ئەو دەمەی ئەستەمبوڵ کە ناوی «صاری خضر چەلەبی» بوو ناوبانگی دادگەریی ئەم قازی‌یەش بە سەرتاسەری ئیمپراتۆرێتیی عوسمانی‌دا بڵاوبووبووەوە بەڵێ ڕۆشت بۆ لای ئەم قازی‌یە و سکاڵای ئەو ستەمەی لە لا کرد کە سوڵتان محمد فاتیح لەگەڵی‌دا نواندوویەتی

قازی لە وەرگرتنی ئەم سکاڵایەدا هیچ دوودڵی‌یەک ڕووی تێ نەکرد

بەڵکو یەکسەر یەکێکی نارد بە دوای سوڵتاندا تاکو لە بەردەم دادگادا ئامادە بێت ، چونکە یەکێک لە هاوولاتییان شکاتی لێ کردووە !

سوڵتانیش - بە هەمان جۆر - بێ دوودڵی گرتن ، بە دەم داواکاریی قازییەوە ڕۆشت چونکە دەبێ «حەق» و «عەدالەت» لە سەرووی هەموو دەسەڵات و سوڵتانێکەوە بن

لە ڕۆژی دیاری کراودا ، سوڵتان هات بۆ دادگا و ، ویستی لەسەر کورسییەک دابنیشێ بەلام قازی پێیوت :

- نەخێر گەورەم! دروست نییە دابنیشیت.. بەڵکو دەبێ لە تەنیشتی خەصمەکەتەوە بە پێوە ڕابووەستی !

ناچار سوڵتان محمد فاتیح لە تەنیشتی خەصمە ڕۆمییەکەیەوە ڕاوەستا

ئەندازیارە ڕۆمەکە ئەو ستەمەی بۆ قازی ڕوون کردەوە کە لێی کراوە.

کە نۆرە هاتە سەر قسەکردنی سوڵتان ، پشتی سکالای بابای ڕۆمیی گرت و نکوولیی لێ نەکرد ! ئنجا پاش قسەکانی ڕاوەستا و چاوەڕوانی ئەو حوکمەی دەکرد کە قازی دەری‌دەکات

قازی کەمێ بیری کردەوە و ، ئنجا پێیوت :

- ئەی سوڵتان ! بە پێی فەرمانەکانی شەرع دەبێ تۆڵەت لێ بسێنرێتەوە .. دەبێ دەستت ببڕرێتەوە !

ئەندازیارە ڕۆمەکە لە سەرسووڕماندا و بەرامبەر بەم حوکمەی کە قازی دەریکرد لەرز بە جەستەیدا هات ! چونکە نە لە دوور و نە لە نزیکەوە حوکمی وای بە خەیاڵدا نەدەهات ئەوپەڕی ئەو حوکمەی کە چاوەڕوانیی دەکرد بریتی بوو لەوەی قازی بڕیار بدات بە پارەوپوول قەرەبووی ئەم ستەمەی بۆ بکرێتەوە بەلام ئەوەی کە قازی حوکمی بڕینی دەستی سوڵتان محمد فاتیح دەربکات ، ئەو محمد فاتیحەی کە ئەستەمبوولی فەتح کرد و سەرجەمی دەوڵەتەکانی ئەورووپا لەبەری

دەلەرزین    هەرگیز شتی وای بە ئەندنیشەدا نەهاتبوو

بۆیە ئەندازیاری ڕۆمی بە دەنگێکی حەپساو و گوفتارێکی لەرزۆک داوای لە قازی کرد کە   واز لەو حوکمە دەهێنێت و هەر تەنها قەرەبوویەکی نەختینەی لە سوڵتان دەوێ   چونکە بڕینی دەستی سوڵتان چ سوودێک بەم ناگەیەنێ

پاش ئەمە   قازی حوکمی ئەو قەرەبوودی بۆ دەرکرد و بڕیاری دا کە :

«هەتا ئەم ڕۆمە لە ژیاندا بێ ، دەبێ هەموو ڕۆژێک دە پارچە پارەی نەختینەی بدرێتێ بەرامبەر بەو زیانەی لێی کەوتووە» !

بەڵام سوڵتان محمد فاتیح بڕیاری دا لە بریی (دە) هەموو ڕۆژێک (بیست) پارچە پارەی نەختینەی بداتێ   لە خۆشیی ڕزگاربوونی لە تۆڵەی دەست بڕینەوە و   بۆ ئەوەش پەشیمانیی خۆی لەو کارەی دەرببڕێت !

* * *

# سولتان بایەزیدی دووهەم

*چەند زانیاری‌یەکی مێژوویی لە بارەیەوە*

ناوی باوکی   سولتان محمد فاتیح

ناوی دایکی   ست مەکرەمە خاتوون

بەرواری لە دایکبوونی : ١٤٤٧/١٢/٣ز

بەرواری چوونە سەرتەختی   ١٤٨١/٥/٢١ز

بەرواری وازهێنانی لەحوکمڕانی بۆ «سەلیم»ی کوڕی: ١٥١٢/٤/٢٤ز

بەرواری کۆچی دوایی   ١٥١٢/٥/٢٦ز

ئەو هەڵمەت و هێرشانەی کە خۆی سەرکردایەتیی کردوون

* هێرش بۆ «مۆرافا»   ئەوە بوو لەم هەڵمەتەدا «هەرسک»ی خستە سەر دەوڵەتی عوسمانی

* هەڵمەت بۆ سەر «بوغدان»   لە جەنگەکانی ئەم هەڵمەتەی‌دا هەرچەند سەرکەوتنی بەدەست هێنا   کەچی پەتا لەناو سوپاکەی‌دا بڵاوبووەوە و لە ناچاری‌دا گەڕایەوە دواوە

* چەند هەڵمەتێکی تر کە تیایان‌دا چەند قەڵایەکی زۆری تری فەتح کرد ، کە گرنگترینیان قەڵاکانی   «فیلبا و ئەقرەمان و کیلیا» بوو

* هێرشی بۆ سەر «مەجەڕ» برد و   ئابڵۆقەی «بولگراد»ی دا و.. «عەینابەخت و مەردوون و کورون»ی فەتح کرد

* چەند فتووحاتێکی تر لە سەردەمی‌دا ئەنجام دراون ، وەک فەتحی «بۆسنە و لوفجا و بورسجا»

* هەروەک چەند سەرکەوتنێکی لە جەنگە دەریایی‌یەکان‌دا بەدەست هێنا کە گرنگترینیان جەنگی «سابینیزا» و جەنگی «مەدەللی» بوو

لەگەڵ ئەم هەموو فتووحاتانەش‌دا   کەچی هێشتا فتووحاتی ئەم

سەردەمە لە چاو فتووحاتی سەردەمەکانی پێشوودا بە کەم دادەنرێن مێژوونووسان هۆکاری ئەم دیاردەیە دەگێڕنەوە بۆ ئەوەی کە «سولتان بایەزیدی یەکەم» زیاتر پیاوی زانست و ئاین و تەسەووف بووە تا ئەوەی سوارچاک و فاتیح بێت !

* * *

# دوو چیرۆك
# لەبارەی سوڵتان بایەزیدی دووهەمەوە

مزگەوتی «بایەزید» بە یەکێک لە مزگەوتە هەرە گەورە و جوانەکانی شاری ئەستەمبووڵ دادەنرێت و ، گۆڕەپانەکەی بەردەمیشی هەر بەو ناوەوە ناسراوە و پێی دەوترێ «گۆڕەپانی بایەزید» هەروەک زانکۆی ئەستەمبووڵیش دەکەوێتە بەرامبەری ئەم مزگەوتەوە

بنیاتنەری ئەم مزگەوتە سوڵتان بایەزیدی دووهەمە کە کوڕی سوڵتان محمد فاتیح و باوکی سوڵتان سەلیم و باپیری سوڵتان سولەیمانی قانوونی‌یە .

سوڵتان بایەزیدی دووهەم گەلێ خاوەن تەقوا و وەرع بووە ئەم دوو چیرۆکەی خوارەوە ئاماژە بۆ ئەم ڕاستی‌یە دەکەن :

### * چیرۆکی یەکەم

### یەکەم نوێژ لە مزگەوتی «سوڵتان بایەزید»دا

کاتێ بنیاتنانی مزگەوتی بایەزید تەواو بوو و فەرش و ڕایەخی تێدا ڕاخرا ڕۆژی ئیفتیتاحی هاتە پێشەوە بەڵام ئایا کێ لەم یەکەم نوێژەدا پێش نوێژی بکات ؟ ئایا ئیمامی دیاری‌کراوی مزگەوتەکە ؟ یان شێخولئیسلام ؟ یان یەکێ لە زانا ناسراوەکان ؟ کەس ئەمەی نەدەزانی و هەموو ئامادەبووانیش چاوەڕوانی ئەو کەسەیان دەکرد کە ئەم پێش‌نوێژی‌یەیان بۆ بکات

کاتێ کە قامەت کرا و حەشاماتەکە بۆ نوێژکردن ڕیزیان بەستبوو ، ئیمامی دیاری‌کراوی مزگەوتەکە ڕووی تێ کردن و وتی :

– با کەسێک لەم نوێژەدا پێش‌نوێژیان بۆ بکات کە لە هەموو ژیانی‌دا نوێژی بە قەزا نەگێڕابێتەوە ، واتە کەسێک بێت کە لە هەموو

تەنەمەنی‌دا نوێژێکی فەرزی نەچوویێت و هەموویانی لە کاتی خۆیان‌دا ئەدا کردبێت !

ئامادەبووان سەریان لەم مەرجە سوورِما ! بۆیە هەریەکەیان بە سەرسامی‌یەوە بۆ ئەوانی تری دەڕوانی !!

بەلاّم ئەم سەرسامی‌یە زۆری نەخایاند چونکە چەند خولەکێکی نەبرد بینییان سولْتان بایەزیدی دووهەم بە ئارامی و هێمنی ڕۆشتە پێشەوە و بەوپەڕی خشوعەوە «اللّه أكبر»ی کرد و نوێژی بۆ دابەستن !

بەلْێ ، لە نێوان هەموو ئامادەبووان‌دا تەنها ئەو بوو کە لە درێژایی تەمەنی‌دا هیچ نوێژێکی نەفەوتابوو !

بۆیە لە لایەن میللەتەوە ناونرابوو «سولْتانی وەلی» !

* * *

### * چیرۆکی دووهەم

### تۆزی جیهاد لە پێناوی خوای گەورەدا

سولْتان بایەزیدی دووهەم کردبووی بە عادەت کە هەرچی جارە لە جیهاد و غەزا دەهاتەوە چەندە تۆزی «جیهاد» لە جل‌وبەرگەکەی نیشتبوو کۆی دەکردەوە و لە شووشەیەک‌دا هەڵی دەگرت

جارێکیان کە لە جیهاد هاتبووەوە و خەریکی کۆکردنەوەی ئەو تەپ و تۆزە بوو کە لە بەرگەکانی نیشتبوو تاکو بیخاتە ناو شووشەکەوە «گوڵبەهار»ی خێزانی لێی پرسی

– گەورەم ! مۆڵەت هەیە پرسیارێک بکەم ؟

– فەرموو گوڵبەهار ! بپرسە .

– بۆچی هەموو جارێک ئەم کارە دەکەیت و چ سوودێک لەم تەپ و تۆزەدا هەیە کە لەم شووشەیەدا کۆی دەکەیتەوە ؟

- گوڵبەهار ! وەسیەت دەکەم کە مردم لەم تەپ و تۆزە خشتێک دروست بکەن و لە گۆڕەکەمدا بیخەنە ژێر سەرم .. ئایا نازانی - ئەی گوڵبەهار خاتوون ! - کە خوای گەورە جەستەی ئەو کەسانە لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزێ کە لە پێناوی ئەودا جیهادیان کردووە ؟!

هەروەهایش بوو .. وەسیەتەکەیان بۆ جێ بەجێ کرد و ، لەو تەپ و تۆزەی کە لەناو شووشەکەدا کۆکرایەوەو هی جیهادی «في سبیل الله» بوو، خشتێک دروست کرا و و کاتێ کە لە ساڵی ١٥١٢زدا ئەم سوڵتانە خاوەن وەرع و تەقوایە کۆچی دوایی کرد ، ئەو خشتە خرایە ژێر سەری لە گۆڕەکەیدا ، کە دەکەوێتە تەنیشتی ئەو مزگەوتەی بنیاتی نا و پێی دەوترێ : «مزگەوتی بایەزید» .

دەسا خوای گەورە لێی خۆش بێ . ئامین .

* * *

# سوڵتان سەلیمی یەکەم

## کە بە نازناوی «یاوز» واتە (توندوتیژ) بەناوبانگە

*چەند زانیاری یەکی مێژوویی لەبارەیەوە*

ناوی باوکی   سوڵتان بایەزیدی دووەم

ناوی دایکی   گوڵبەهار خاتوون

بەرواری لەدایک بوونی   ١٠/١٠/١٤٧٠ز

بەرواری چوونەسەرتەختی   ٢٤/٤/١٥١٢ز

بەرواری کۆچی دوایی   ٢١-٢٢/٩/١٥٢٠ز

گرنگترین کارە جەنگی یەکانی

هێرش بۆ سەر ئێران و سەرکەوتنی بەسەر صەفەوی یەکاندا

* هەڵمەت بۆ سەر هەندێ میرنشینی تورک و خستنیان بۆسەر دەوڵەتی عوسمانی.

* گرتنی چەند قەڵایەک

* هێرش بۆ سەر میسر و سەرکەوتنی لە جەنگی «مرج دابق»دا و ، زاڵ بوون بەسەر «میسر و سووریا و فەلەستین» و ، خستنی «حجاز»یش بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی

* خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ و ماردین و باکووری عیراقی خستە سەر دەوڵەتی عوسمانی

* یەکەم خەلیفە بووە لە عوسمانی یەکاندا

* * *

# سوڵتان سەلیم و «شیخ الإسلام»

هەر ئەوەندەی «سوڵتان سەلیم» زانیی کەمایەتی‌یە ناموسڵمانەکانی ناو شاری «ئەستەمبووڵ» وەک «ئەرمەن و ڕۆم و جوولەکە» خەریکن هەندێ کێشە و گیر و گرفت بۆ دەوڵەت دەنێنەوە و ئاشووب دەوروژێنن، گەلێ تووڕە بوو و بڕیاری دا کە ئەم کەمایەتییانە دەبێ موسڵمان بکرێن ، دەنا ئەوەی موسڵمان نەبێت لە گەردنی بدرێت !

هەواڵی ئەم بڕیارەی سوڵتان گەیشتەوە بە «شیخ الإسلام : زمبیللی علی جمال أفندی» کە یەکێک بوو لە گەورە زانایانی سەردەمی خۆی . ئەم هەواڵەی زۆر پێ ناخۆش بوو ، چونکە زۆرکردن لە خەڵکی بۆ موسڵمان کردنیان کارێکی پێچەوانەی تەعلیماتی ئایینی ئیسلامە کە ئالای ﴿لا إكراه في الدين﴾ی هەڵکردووە بۆیە دروست نی‌یە بۆ هیچ کەسێ بە پێچەوانەی ئەم یاسایە ڕەفتار بکات ، تەنانەت گەر سوڵتانیش بێت !

بەڵام کێ لە بەردەم ئەم سوڵتانەدا ڕابووەستێ ؟ خۆ هەموو کەسێک لە بەردەمی‌دا دەلەرزێ کێ دەتوانێ ڕووبەڕووی ئەم سوڵتانە توندوتیژە بڵێ کارەکەت هەڵەیە لەگەڵ ئایینی ئیسلام‌دا یەک ناکەوێ بە پێی یاسای شەرع کارێکی حەرامە ؟

دیارە کەس نی‌یە بتوانێ ئەم ئەرکە بگرێتە ئەستۆ جگە لە خۆی ، چونکە هەر ئەوە کە مەنسەبی «شیخ الإسلام»ی لە دەوڵەتی عوسمانی‌دا خراوەتە ئەستۆ، کەواتە لابردنی ئەم «مونکەر»ەی کە خەریکە ڕوویدات، دەکەوێتە ئەستۆی خۆی .

بۆیە خێرا جوببەکەی لەبەر کرد و بەرەو کۆشکی سوڵتان کەوتە ڕێ و، لەوێ ئیزنی چوونەژوورەوەی خواست کە ڕوخسەت درا لەوێ بە سوڵتانی وت :

- ئەی سوڵتان ! بیستوومە دەتەوێ کەمایەتی‌یە ناموسڵمانەکان ناچار بکەیت بە زۆرەملێ موسڵمان ببن ؟

سوڵتان هێشتا هەر تووڕەیی‌یەکەی نەنیشتبووەوە ، بەو حاڵەوە وتی:

- بەڵێ ، ئەوەی بیستووتە ڕاستە.. بەڵام ئایا ئەم کارە چیی تێدایە؟

خۆ شێخولئیسلامیش کەسێک نەبوو لە وتنی قسەی حەقدا دوودڵی بیگرێ ، بۆیە پێی وت :

- ئەی سوڵتان ! ئەم کارە دژ و پێچەوانەی شەرعە ، چونکە کەس بە زۆرەملێ موسڵمان ناکرێ ﴿لا إكْراهَ في الدِّينِ﴾ ئنجا کاتێ «محمد فاتیح»ی باپیرتان شاری ئەستەمبوڵی فەتح کرد شوێن تەعلیماتی شەرعی ئیسلام کەوت و ، زۆری لە کەس نەکرد موسڵمان ببێ ، بەڵکو سەربەستیی بیر و باوەڕی بە هەموو کەسێک بەخشی جا دەبێ ئێوەش شوێن شەرعی پیرۆزی ئیسلام بکەون و بە ڕێچکەی سەردەمی «محمد فاتیح»ی باپیرتاندا بڕۆن و هەنگاو بنێن .

سوڵتان سەلیم - کە تووڕەبوونەکەی هەر لە زیادبووندا بوو - وتی:

- عەلی ئەفەندی عەلی ئەفەندی ! خەریکی دەست لە کاروباری دەوڵەت وەردەدەیت پێم ناڵێیت هەتا کەی واز لەم خۆهەڵقورتاندنە ناهێنی ؟!

- من - ئەی سوڵتان ! - کارمەندی‌یەکەی ئەستۆم جێبەجێ دەکەم کە بریتی‌یە لە «ئەمر بە مەعرووف و نەهی لە مونکەر» جگە لەمە من هیچ ئامانجێکی ترم نی‌یە خۆ ئەگەر ئەجەلیشم تەواو نەبوویێ ، ئەوا هیچ کەسێ ناتوانێ ڕۆحم بکێشێ !

- ئەی «شیخ الإسلام» ! ئەم کارانە بۆ من بەجێ بهێڵە .

- نەخێر ئەی سوڵتان ! واجبی منە کە چاودێریی قیامەتی تۆ بکەم و دوورت بخەمەوە لە هەر شتێک کە ژیانی ئەودنیات تێک‌بدات گەر تەنانەت ناچاریش بوویێتم ڕێگایەکی تر بگرمەبەر !

- مەبەستت چی‌یە ؟

- ئەو کاتە ناچار دەبم لەبەر ڕەفتارکردنت بە پێچەوانەی ئەحکامی شەرع ، فەتوا دەربکەم لەسەر حوکم لا ببرێت !

«سوڵتان سەلیم» لەبەر ئەوەی لەڕادەبەدەر ڕێزی زانایانی دەگرت ، لە دوایی‌دا ملی بۆ داواکاری‌یەکەی «شیـخ الإسلام» کەچ کرد و ، کەمایەتی‌یەکانی تر هەر وا بە سەربەستی مانەوە لە بیروباوەڕ و پەرستن و دادگایان‌دا بێ ئەوەی کەس بە نیازی خراپ تەنانەت پەنجەشیان بۆ ڕابکێشێ !

* * *

# سوڵتان سەلیم و .. زانای ئایینی «إبن الكمال»

دوای ئەوەی سوڵتان سەلیم میسر و شامی خستە سەر دەوڵەتەکەی و لە میسرەوە دەگەڕایەوە و ، بوو بە یەکەم «خەلیفە» لە عوسمانی‌یەکاندا .. لە پێشەنگی سوپاکەیەوە بە سواری ئەسپێکی ڕەسەنەوە لەگەڵ «إبن الكمال»دا گفت‌وگۆیان دەکرد ، کە ئەویش لە گەورە زانایانی سەردەمی خۆی بووە . ئنجا وەزیران و فەرماندەکانی سوپاش لە پشتیانەوە دەڕۆشتن .

لەم کاتەدا کە بە قسەکردنەوە سەرقاڵ بوون ، ئەسپەکەی «إبن الكمال» سڵەمی‌یەوە و پێ‌کانێ بە توندی دا بە زەوی‌یە قوڕاوی‌یەکەدا و پرژەی قوڕەکەش لە شێوەی چەند پەڵەیەکی زۆردا بەر «قەفطان»ەکەی(١) سوڵتان کەوت !

ڕەنگی «إبن الكمال» زەرد هەڵگەڕا .. گومانی لەوەدا نەما کە تازە تیاچووە ! دڵی وەزیر و فەرماندەکانیش کەوتە لێدان و هەموویان ترسیان بۆ «إبن الكمال» لێ نیشت ، چونکە چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد کە شمشێر ملی بپەڕێنێ !

کەچی سوڵتان زۆر بە هێمنی «قەفطان»ە قوڕاوی‌یەکەی لەبەر داکەندو داوای قەفطانێکی تری کرد .. ئنجا بە «إبن الكمال»ی وت :

– ئەم قەفطانەی کە قوڕی ئەسپی زانایەکی گەورەی وەکو تۆی بەرکەوتووە ، بە یەکێک لە شتە بەنرخەکانی خۆمی دادەنێم و ، وەسیەتیش دەکەم هەر بەو جۆرە هەڵبگیرێ و پارێزگاریی لێ بکرێ ، بۆ ئەوەی کە مردم لە کاتی بەڕێ‌کردنی تەرمەکەمدا بخرێتە سەر تابووتەکەم.

---

(١) قەفطان : پۆشاکێکی گەورەی سەر تا بە دامێنە و ، بە وێنەی عەبای شێخ و زانایان لە پێشەوە کراوەتەوە ، بەڵام لە هەردوو لاکەیەوە پشتێنی پێوەیە بۆ بەستن لەسەر جوببەوە لەبەر دەکرێ . (وەرگێڕ)

هەروەهایش بوو    کاتێ کە سولتان مراد وەسیەتەکەیان بۆ جێبەجێ کرد و    ئەم قەفطانەی کە بەو قورە پیس بوو بوو    خستیانە سەر تابووتەکەی و بەو شێوەیە بەرەو گۆڕەکەی بەرێیان کرد !

* * *

# سوڵتان سەلیم لە مزگەوتی گەورەی دیمەشق‌دا

دوای ئەوەی کە سوڵتان سەلیمی یەکەم لە بەرواری ١٥١٦/٩/٢٧زدا دیمەشقی خستە سەر دەوڵەتی عوسمانی ، بۆ نوێژی جومعە ڕۆشت بۆ گەورەترین مزگەوتی ناو شار ، کە ئەمەش یەکەم نوێژی جومعەی بوو لەو شارەدا

لە ڕیزی یەکەمی نوێژدا و لە نزیکی میحرابەکەوە وەزیران و فەرماندەکانی سوپاکەی و زانایان و پیاوماقووڵانی دیمەشق لەم لا و لەو لایەوە دانیشتبوون

دوای خوێندنی قورئانی پیرۆز و ئەنجامدانی نوێژی سوننەت خەطیب ڕۆشتە سەر مینبەر بۆ خوێندنەوەی وتارەکەی ئەمەش یەکەم وتار بوو لە دیمەشق‌دا کە ناوی سوڵتان سەلیمی تێدا بهێنرێت ..

جا هەر ئەوەندەی خەطیب لە وتارەکەی‌دا گەیشتە سەر ئەم دوعایە «اللهم انصر السلطان سليم ، سلطان البر و حاكم الحرمين»(١)

یەکسەر سوڵتان سەلیم سەری بەرز کردەوە و بە خەطیبەکەی وت

– من «حاكم الحرمين» نیم بەڵکو «خادم الحرمين»م بەم جۆرە وتار بدە !

خەطیبەکەش بە ناچاری شێوازی وتارەکەی گۆڕی بەو جۆرەی کە سوڵتان پێی خۆش بوو !

* * *

(١) ئەو کاتە «حیجاز» سەر بە میسر بوو جا کاتێ کە سوڵتان سەلیم لە بەرواری ١٥١٦/٨/٢٤زدا میسری خستە ژێر دەستی ، «حیجاز» کەوتە سەر دەوڵەتی عوسمانی و ، شەریفی ئەو کاتەی «مەککە»ش کە ناوی «برکات» بوو ، کوڕەکەی خۆی نارد بۆ میسر بۆ لای سوڵتان سەلیم و کلیلی شاری «مەککە» و «مەدینە» و سەرجەم «ئەمانەتە موقەددەسەکان»ی پیادا نارد بۆ سوڵتان سەلیم کە ئێستا لە مۆزەخانەی «طۆپ قاپی سەرای» لە ئەستەمبوڵ پارێزاون . (دانەر)

# سوڵتان سەلیم
## بە پەنهانی دەڕواتەوە بۆ ناو ئەستەمبووڵ !

سوڵتان سەلیمی یەکەم هەشت ساڵ حوکمی کرد ، بەلاّم لە ماوەی ئەم هەشت ساڵەدا هێندە کاری ئەنجام دا کە مەگەر بە زەحمەت بتوانرایە بە دوو هێندەی ئەم ماوەیە ئەنجام بدرێن

کاتێ کە ئەم سوڵتانە لە هەڵمەتە بەناوبانگەکەی‌دا بۆ سەر میسر گەڕایەوە کە هەڵمەتێک بوو «سووریا و فەلەستین و باکووری عێراق و حیجاز و میسر»ی تێدا خستە سەر دەوڵەتی عوسمانی و «خەلافەت»ی تێدا گرتە دەست

کاتێ لەم هەڵمەتەی گەڕایەوە و نزیکی شاری «ئەستەمبووڵ»ی پایتەختی حوکمڕانی‌یەکەی بووەوە ، خەڵکی شار هەواڵی هاتنەوەی سوڵتانیان بیست و زانییان نزیکی شار بووەتەوە لەبەر ئەوە ، هەموو ڕۆژێک لەماڵەکانیان دەهاتنە دەرەوە و لەسەر شەقام و جادەکان‌دا ڕیزیان دەبەست بۆ پێشوازی لێ کردنی سوڵتان و بینینی و هێتاف‌کێشان بۆ ژیانی ، دوای ئەوەی کە ئەم زنجیرە کارە سەربازی‌یە سەرکەوتوانەی ئەنجام دابوو

سوڵتان کە ئەم هەواڵەی بیست زۆری پێ ناخۆش بوو بۆیە فەرمانی دا سوپاکەی لە بەری ئاسیا لا بدەن و هیچ کەسێک نەپەڕێتەوە ئەوبەر بۆ ناو «ئەستەمبووڵ» (کە ئەو کاتە تەنها لە بەری ئەورووپادا بوو (١) تا خۆی فەرمانیان بۆ دەردەکات

(١) بەلاّم ئێستا ئەستەمبووڵ شارێکی گەورەیە و هەردوو بەری ئاسیا و ئەورووپا گرتووەتەوە و دەریەندی بسفۆڕیان دەکەوێتە نێوانەوە (دانەر)

وەزیران و فەرماندەکانی سوپا و سەرجەمی سەربازەکانیش لەم فەرمانەی سوڵتان سەرسام مابوون و هۆکارەکەیان نەدەزانی چی‌یە ؟

کەسیش پرکێشیی ئەوەی نەدەکرد لە سوڵتان بپرسێ لەبەر چی ئەم فەرمانەی دەرکردووە کە هەموویان یەکسەری جێبەجێیان کردبوو ؟

خۆ هێشتا ڕۆژە و شەو دانەهاتووە تەنها هێندەیان ماوە کە بە ماوەی سەعاتێک هەموویان بپەڕنەوە ئەوبەر

لە لایەکی تریشەوە هەموویان بە تاسە و شەوقەوە چاوەڕوانی ئەوە بوون بڕۆنەوە ناو ماڵ و منداڵ و خاوخێزانی خۆیان بەڵام ئەم دواخستنە لە پێی چی؟ لە کاتێکدا کە هەموو خەڵکی ئەستەمبووڵ زۆر بە گەرمی‌و پەرۆشی چاوەڕوانی هاتنەوەی سوڵتانن و لە شەقام و مەیدانەکاندا کۆبوونەتەوە تاکو ئاهەنگ بۆ هاتنەوەی سوڵتان و سوپا سەرکەوتووەکەی بگێڕن و هێتاف بۆ ژیانی سوڵتان لێ بدەن و دوعای خێری بۆ بکەن ؟!

بەڵام فەرماندەکان و سەرجەمی سوپا بەناچاری‌یەوە فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد و ، هەر هەموشیان چاوەڕوان و ئومێدەواری ئەوە بوون کە سوڵتان ڕاکەی خۆی بگۆڕێت و ڕێیان پێ بدات بڕۆنەوە ناو ئەستەمبووڵەوە

کەچی سەعات لە دوای سەعات دەڕۆشت و خۆریش بەرەو ئاوابوون دەڕۆشت لەگەڵ ئەوەشدا هیچ نیشانە و ئاماژەیەک دیار نەبوو کە سوڵتان ڕای خۆی بگۆڕێت !!

ئایا کێ دەتوانێ لەگەڵ سوڵتاندا بۆ ئەم مەبەستە قسە بکات ؟ وەزیر و فەرماندەکان لەناو خۆیاندا ڕاوێژیان بۆ ئەم مەبەستە کرد و تێکڕا پێیان وابوو باشترین کەس کە بگونجێ بینێرنە لای سوڵتان زانای پایەبەرز «إبن الكمال» کە سوڵتان گەلێ ڕێزی لێ دەگرێت‌و خۆشی دەوێت

ڕۆشتن بۆ لای «إبن الكمال» و داواکاری‌یەکەیان پێ وت ئەویش بەڵێنی دانێ ئەم کارە بخاتە ئەستۆی خۆی . بۆیە ڕۆشت و ئیزنی خواست بڕواتە ژوورەوە بۆ لای سوڵتان کە ئیزن درا و ڕۆشتە بەردەمی سوڵتان لە خێوەتەکەی‌دا ، پێی‌وت

- شتێکم پێ‌یە - ئەی سوڵتان ! - دەمەوێ پێتانی بڵێم .

- چیت پێ‌یە - ئەی «إبن الكمال» ! - فەرموو بیڵێ

- گەورەم ! سەربازەکانت تووشی سەرسامی بوون و دەپرسن بۆچی سوڵتان ناڕواتە ناو شارەوە ؟ خۆ هەموو خەڵکی شاری ئەستەمبووڵ بە شەوقەوە چاوەڕوانی دیداری سوڵتان دەکەن تاکو هێتافی بۆ بکێشن و ئاهەنگ بۆ هاتنەوەی خۆی و سوپا سەرکەوتووەکەی بگێڕن ؟

سوڵتان سەلیمیش ئەم وەڵامە ڕەنگینەی دایەوە کە لەو کاتەوە مێژوو پاراستویەتی و هەر لە گوێی‌دا دەزرنگێتەوە

- ئەی «إبن الكمال» ! دەڵێی هێشتا نەت‌ناسیوم ؟ ئێمە لە پێناوی ناوبانگ و سەربەرزی یاخود بەدەستهێنانی هێتاف‌کێشان‌دا نەچووینەتە جەنگەوە بەڵکو تەنها لە ڕێی خوای گەورەدا و لە پێناوی ڕەزامەندیی ئەودا کەوتینە ئەو جەنگانەوە !

* * *

هەر کە شەو داهات و خەڵکی ئەستەمبووڵیش هەرکەسە و ڕۆشتەوە بو ناو ماڵی خۆی ، سوڵتان فەرمانی بە سوپاکەی دا بڕژنەوە ناوشار ! ئنجا خۆیشی لەگەڵ چەند کەسێک لە پاسەوانەکانی ، سواری بەلەمێک بوون و بە پەنهانی و بێ ئەوەی هیچ کەسێک لە خەڵکی ئەستەمبووڵ پێی بزانێ ، ڕۆشتەوە ناو شار و گەڕایەوە بۆ ناو کۆشکەکەی خۆی !

* * *

# سوڵتان سەلیم لە سەرەمەرگ‌دا

لە ڕۆژی ١٥٢٠/٧/١٧زدا واتە لە ئێوارەی ئەو ڕۆژەی کە بۆ سبەینیٚ هەڵمەت دەبرا بۆ «ئەدیرنە» .. سولتان سەلیمی یەکەم لەگەڵ «حسن جان»ی یاوەری بەناو باخچەی کۆشکەکەی‌دا پیاسەی دەکرد دوای ماوەیەک پیاسە و هات‌وچۆ ، سوڵتان ئاوڕی لە «حەسەن» دایەوە و وتی

- وا هەست دەکەم «شیش»ێکی داخکراو بەینی هەردوو شانم بسووتێنیٚ . ئایا - حەسەن ! - سەیرێکم بۆ ناکەی ؟!

حەسەنیش لە سوڵتان نزیک بووەوە کە ناوشانی خۆی بۆ دەرخستبوو بینیی زیبکەیەکی سووری بچووکە کە پەنجەی لیٚ دا دەرکەوت زیبکەیەکی ڕەقە بۆیە بە سوڵتانی وت :

- گەورەم ! پێم باشە خۆت پیشانی پزیشکێک بدەیت تاکو چەوری‌یەک لەسەر ئەم زیبکەیە دابنێت لەوانەی کە ئەم جۆرە زیبکە و حاڵەتانەی پیٚ چەور دەکەن

بەڵام سوڵتان قبووڵی نەکرد و وتی

- ئایا لەبەر ئەم زیبکە بچووکە خۆم پیشانی پزیشک بدەم ؟ بۆچی تۆ من بە لاوێکی نەرم و ناسکۆڵە دەزانی تا کاری وا بکەم ؟ ئەوە ناهێنیٚ خۆی بۆ خۆی لا دەچیٚ و نامێنیٚ .

حەسەنیش نەیتوانی ئیلحاحی زیاتری لیٚ بکات .

بەڵام ئەو شەوە سوڵتان سەلیم نەیتوانی چاوەکانی لەیەک بنیٚ چونکە ئازارەکەی هێندە زیادی کردبوو دەت‌وت ئاگر لە نێوان هەردوو شانی‌دا هەڵگیرسێنراوە

هەر کە نوێژی بەیانیی کرد ، فەرمانی دا حەمامێکی گەرم‌وگوڕی بۆ ئامادە بکەن . کە ڕۆشتە ناو حەمامەکەوە داوای لە ناترەکەی کرد زیبکەکەی بۆ بگووشێت کە هێندە گەورە بووبوو وەک دمەڵێکی گەورەی

لیٚ هاتبوو .. ئەم دمەڵە لەو جۆرە بوو کە تورکەکان پێی دەڵێن «شێرپەنجە» (١) و دەبێت بە مایەی گیان لەدەست دانی ئەو کەسەی تووشی دەبێت بەڵام زانستی پزیشکیی ئەو کاتە نەیدەتوانی چارەسەری بکات

هەرچۆن بوو دانی بە خۆی و ئازارەکەی‌دا گرت و ، کەوتە خۆئامادەکردن بۆ سەفەری «ئەدیرنە» و هیچ گوێی بە تکای کەسانی دەوروبەری خۆی نەدا سەبارەت بە دواخستنی ئەم هێرشە یان دانانی فەرماندەیەکی تری غەیری خۆی بۆ ئەم مەبەستە ئەوە بوو وتی

– تازە بەڵێنیکە و داومانە ئێمە لەو کەسانە نین کە لە بەڵێنی خۆیان پەشیمان دەبنەوە .

بەم جۆرە سوپای هەڵمەتەکە بە سەرکردەیی خودی سوڵتان سەلیم لە رۆژی ١٥٢٠/٧/١٨زدا بەرەو «ئەدیرنە» کەوتە رێ ، لە کاتێک‌دا کە سوڵتان بە ئازاری سەختەوە دەتلایەوە

ئازارەکەی لە رێگادا پتر زیادی کرد گەیشتە رادەیەکی ئەوتۆ کە لە توانای کەس‌دا نەبوو بەرگەی بگرێت کەچی هەر لە رۆیشتن‌دا بەردەوام بوو تا گەیشتنە شیوی «ئۆگراش» لەوێ‌دا سوڵتان وای لیٚ هات کە نەیدەتوانی خۆی بەسەر ئەسپەکەیەوە رابگرێت بۆیە فەرمانی دا سوپاکە رابووەستێت و لەو شوێنەدا خێوەتیان هەڵدا و ، سوڵتان لەناو خێوەتەکەی لەسەر پێخەفی نەخۆشی‌دا راکشا ئازارەکەی بەرەبەرە زیادی دەکرد تا وای لیٚ هات وەکو ئاگر هەڵی دەقرچاند ، کەچی لەگەڵ ئەوەش‌دا دانی بەخۆی‌دا دەگرت و نە هاواری دەکرد و نەدەگریا ، بەڵام ئازارە سەختەکەی لە چاوەکانیەوە بە ئاشکرا دیار بوو !

ئاورێکی لە حەسەنی هاودەمی دایەوە و پێی وت

– نابینی حەسەن لە چ حاڵێکداین ؟ خەریکین وەک منداڵی بچووک لەتاو ئازار دەست بە گریان بکەین !

هاودەمە دڵسۆزەکەی کە لەو کاتەدا دەی‌ویست فرمێسکەکەی لە چاوانی بازنەداتە خوارەوە ، وتی

(١) دمەڵێکی خوێناوی‌یە ، لە میکرۆبی «ڕەستافیلۆک»ەوە پەیدا دەبیٚ (دانەر)

– گەورەم ! هەندێ بحەوێرەوە پشت بە خوا پزیشکەکان کاری پێویست ئەنجام دەدەن

– حەسەن ! من باش دەزانم کە چاری مردن تەنها هەر «مردن»ە (١).

ئەوەبوو «سوڵتان سەلیم» ئیتر بە «سەلیمی»ـ لە جێ هەڵنەسایەوە و ڕۆژ لە دوای ڕۆژو حەفتە لە دوای حەفتە ئازارەکەی زیادی دەکرد تا وای لێ هات کە هەموو جەستەی گرتەوە و تەنانەت جمگەکانیشی بە ئازارەوە دەتلانەوە و پزیشکەکانیش دەستەوسان مابوون و نەیاندەتوانی چ یارمەتی و چارەسەری‌یەکی پێشکەش بکەن

سوڵتان هەستی کرد کۆتایی تەمەنی نزیک بووەتەوە بۆیە ناردی بە شوێن صەدری ئەعزەم «بەیری محمد پاشا» و وەزیران «مصطفی پاشا» و «ئەحمەد ئەرنائووط پاشا»دا

پێش هاتنی ئەوان خێوەتەکە جگە لە سوڵتان و حەسەنی یاوەری کەسی تری لێ نەبوو سوڵتان بە زەردەخەنەیەکی ئاوێتەی خەم و ئازارەوە ڕووی کردە حەسەن و وتی

– حەسەن ! ئەمە چ حاڵێکە ؟

حەسەن وتی

– ئەمە ئەو کاتەیە – ئەی سوڵتانم ! – کە مرۆڤ تیای‌دا لەگەڵ خوادا بێت !

سوڵتان ناوچاوانی گرژ کرد و وتی

– بۆچی حەسەن ! پێت وایە ئێمە تا ئێستا لەگەڵ کێ‌دا بووین ؟

حەسەن وەڵامی نەدایەوە ، بەڵکو لە گۆشەیەکی خێوەتەکەدا دانیشت و دەگریا تا هەستی کرد صەدری ئەعزەم «بەیری محمد پاشا» هاتە ژوورەوە

سوڵتان بە دەنگێکی لاواز بە صەدری ئەعزەمی وت :

– ببوورن کە لەبەر نەخۆشی‌یەکەم نەمتوانی بە ڕاوەستانەوە پێشوازیتان لێ بکەم !

---

(١) مەبەستی ئەوەیە کە مرۆڤ یەک جار دەمرێت خۆ کە مرد ئیتر جارێکی تر مردن بە خۆیەوە نابینێتەوە (دانەر)

صەدری ئەعزەم خۆی دا بەسەر دەستەکانی سوڵتان‌دا و ، فرمێسک بە چاوەکانی‌دا دەهاتە خوارەوە و ، بە دەم گریانەوە وتی

- ئەی سوڵتانم ! إن شاء الله خوای گەورە شیفات دەدات

- نەخێر ئەی محمد ! ئەمەندەم بەسە هەست بە لاوازبوونێکی زۆر دەکەم لەدەست ئەم ئازارانە ماندوو بووم دەمانەوێ ئەم ئازارانە کۆتاییان پێ بێت تەنانەت گەر بە مردنیش بووبێت دوای خۆم «سولەیمان»ی کوڕم دەبێ بە سوڵتان ، جا ئەو دڵسۆزی‌یەی بەرامبەر من دەرتان‌بڕی بۆ ئەویشی دەربڕن پاشان ئاوڕێکی دایەوە و چاوی بۆ حەسەنی هاودەمی دەگێڕا وتی

- «حەسەن جان» لە کوێ‌یە ؟

خێرا حەسەن هات و وتی :

- بەڵێ گەورەم ! لە نزیکتانەوەم

- حەسەن ! سوورەتی «یاسین»م بۆ بخوێنە

حەسەن لە نزیکی پێنخەفەکەی سوڵتانەوە بەچۆک‌دا هات و دەستی کرد بە خوێندنی سوورەتی «یاسین» ، لەم کاتەش‌دا بە خوڕ فرمێسک لە چاوەکانیەوە دەهاتە خوارەوە تا سوورەتی «یاسین»ی تەواو کرد ئنجا لە ناوەندی فرمێسکەکانیەوە سەیرێکی سوڵتانی کرد بینیی سوڵتان بە دەستەکانی ئاماژەی بۆ کرد کە جارێکی تریش سوورەتی «یاسین»ی بۆ بخوێنێتەوە

حەسەن دەستی کردەوە بە خوێندنی سوورەتی «یاسین» تا گەیشتە ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ ﴿ لَهُم فِيهَا فَاكِهَةٌ و لَهُم مَا يَدَّعُونَ ۞سَلَامٌ قَولاً مِن رَبٍّ رَحِيمٍ﴾ سوڵتان هەناسەیەکی درێژی کێشا .. لێرەدا حەسەن لە خوێندنی سوورەتەکە ڕاوەستا کە سەیری سوڵتانی کرد ، بینیی گیانی سپاردووە دەستەکانی سوڵتانی بە دەستەوە گرت و خۆی و صەدری ئەعزەم دایانە پڕمەی گریان ئنجا حەسەن وتی

- ئای سوڵتانی گەورە و بەڕێزم ! خوای گەورە لێت خۆش بێت !

ئەمەش لە شەوی جومعە لەسەر شەممەی ٢١-١٥٢٠/٩/٢٢زدا بوو

* * *

# سوڵتان سولەیمانی قانوونی

*چەند زانیاری‌یەکی مێژوویی لەبارەیەوە*

ناوی باوکی : سوڵتان سەلیمی یەکەم .

ناوی دایکی : حەفصە خاتوون

بەرواری لەدایکبوونی ١٤٩٥/٤/٢٧ز

بەرواری چوونەسەرتەختی ١٥٢٠/٩/٣٠ز

بەرواری کۆچی دوایی : ٦-١٥٦٦/٩/٧ز

گرنترین کارەکانی

* کاتێ چووە سەر حوکم ڕووبەری ئیمپراتۆریتی‌یەکەی نزیکەی ٥ر٧ ملیۆن کم٢ بوو بەڵام ئەم سوڵتانە بە فتوحاتەکانی خۆی گەیاندی‌یە نزیکەی ١٣ملیۆن کم٢ واتە دوو ئەوەندەی یەکەم جاری لێ کرد

* لە سیازدە هەڵمەت‌دا خۆی سەرکردەیی سوپاکەی کردووە لە دواهەمینیان‌دا (کە تەمەنی حەفتاویەک ساڵ بوە) و کردوویەتیە سەر قەڵای «زیکاتوار» نەخۆش کەوتووە و لە دواهەمین ڕۆژی هێرشەکەدا واتە لە بەرەبەیانی شکست و دەست بەسەردا گرتنی قەڵاکەدا کۆچی دوایی کردووە

* هەندێ لە فتووحاتەکانی ئەمانەن :

«بولگراد ، دوورگەی ڕوودس ، مەجەر ، بەغدا ، وان ، کوررومو بوغدان ، چەند بەشێکی ئێران ، چەند بەشێکی ئەفریقیا »

* * *

# میر سولەیمان و ماموستاکەی

قوناغی یەکەمی پەروەردە کردنی سولتان سولەیمانی قانوونی لەسەر دەستی دایکی - حەفصە خاتوون - و نەنکی (دایکی باوکی) - بەهار خاتوون - دا بووە

کاتێک گەیشتە تەمەنی حەڤدە سالی ، دایکی بردی بۆ ئەستەمبوول بۆ لای باپیری (واتە سولتان بایەزیدی یەکەم) تاکو لەوێ بە تەواوی پەروەردە بکرێ و پێبگات لەوێ زانایەکیان بۆ دەست نیشان کرد کە ناوی «خیر الدین خضر أفندی» بوو زانستە ئیسلامی‌یەکان و ئەدەب و مێژووی لای ئەم زانایە خوێند هەروەک لەوێ فێری سوارچاکی و هونەرەکانی جەنگ و سەربازی بوو

دابی عوسمانی‌یەکان وابوو کە دەبوو هەموو میرێک لە میرەکانیان فێری سنعەتێکی دەستی ببێ ، سەبارەت بە «سولەیمان»یشەوە سنعەتی زەڕەنگەرییان بۆ هەڵبژارد ، بۆیە زەڕەنگەرێکی بە توانا و لێهاتوویان بۆ دەست‌نیشان کرد تاکو فێری زەڕەنگەریی بکات بەلام میر سولەیمان حەزی لەم سنعەتە نەبوو ، بەڵکو زیاتر وانەی مێژووی پێ خۆش بوو هەروەک حەزی لە سواری ئەسپ بوو لەبەر ئەوە ، هەردەم ئەم سنعەتەی پشت‌گوێ دەخست و گوێی پێ نەدەدا ماموستاکەشی بەم گوێ پێ‌نەدانەی میر سولەیمان گەلێ دڵتەنگ دەبوو ، چونکە دەترسا گلەیی لێ بکرێ یاخود سزا بدرێ لەسەر ئەوەی کە گوایا هیچی فێر نەکردبێ !

رۆژێکیان ئەم ماموستایە هێندە لێی تووڕە بوو کە سوێندی خوارد هەزار دار لە بنی پێی میر سولەیمان بدات گەر بایەخ بەم سنعەتە نەدات و لەسەر گوێ پێ نەدان بەردەوام بێت ! بەلام ئەم هەڕەشەیەش چ سوودێکی تێدا نەبوو هەروەک ماموستاکەشی لە چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەدا دەستەوسان ما ، چونکە نەیدەتوانی هەزار دار لە میر سولەیمان بدات ،

هەروەک میریش ڕقی لە مامۆستاکەی هەڵسا و لە ترسان‌دا پەنای برد بۆ لای دایکی و داوای لیٚ کرد ئەم مامۆستایەی بۆ بگۆڕیٚ بە یەکێکی تر و پیٚی وت

- مامۆستاکەم سوێندی خواردووە کە هەزار دارم لیٚ بدات بە باپیرم - سوڵتان - بڵیٚ با ئەم مامۆستایەم بۆ بگۆڕیٚ بە یەکێکی تر ، من خۆشم ناویٚ !

«حەفصە خاتوون» ئافرەتێکی ژیر و بە سەلیقە بوو ، بە باشی ڕێزی مامۆستایانی دەزانی بۆیە ناردی بەشوێن مامۆستای کوڕەکەی‌دا و تکای لیٚ کرد لە کوڕەکەی خۆش ببێت لەگەڵ ئەوەش‌دا دەیان لیرەی زێڕی خەڵات کرد

کە مامۆستا ڕۆشتەوە بۆ شوێنی خۆی ناردی بە دوای میر سولەیمان‌دا و داوای لیٚ‌کرد دابنیشیٚ کە دانیشت لیرە زێڕەکانی خستە کۆشی و پیٚی وت

- دەمەویٚ ئەم لیرە زێڕانە بتوێنیتەوە و پێنج سەد تووڵی باریکیان لیٚ دروست بکەیت !

لەبەر ئەوەش ئەم داوایەی لیٚ کرد ، چونکە بەسەرهاتەکەی حەزرەتی ئەیوبی - دروودی لەسەر بیٚ - هاتەوە یاد ، ئەمیش ویستی وەک ئەو لەم ڕیٚیەوە وەفا بە سوێندەکە بکات و نەی شکێنیٚ

میر سولەیمانیش داواکاریی مامۆستاکەی جیٚبەجیٚ کرد و بۆ ڕۆژی دووهەم تووڵە زێڕە باریەکەکانی هێنا بۆ مامۆستاکەی ئەویش خێرا کردنی بە یەک «دەستە» و ، ئنجا بە میری وت

- وا سوێندەکەی خۆم دەبەمەسەر ! چونکە تۆ هێشتا هەر گویٚ بە وانەکانت نادەیت ؛ خێراکە لەسەر پشت ڕابکشیٚ قاچەکانتم بدەریٚ

میر سولەیمان لە ترسان‌دا چاوەکانی ئەبڵەق بووبوون بەڵام لەگەڵ ئەوەش‌دا داواکاریی مامۆستاکەی جیٚبەجیٚ کرد و ئەویش بە دوو جار دەستە تووڵە زێڕەکانی یە سووکی کێشا بە پاژنەی پیٚی میر سولەیمان‌دا !

بەم جۆرە ، سوێندەکەی خۆی بردەسەر و ، میر سولەیمانیش سوودی لەم دەرسە وەرگرت و ، ئیتر دوای ئەم ڕووداوە بایەخی بەم سنعەتە دەدا ، تەنانەت دەڵێن بوو بە یەکێک لە زەڕەنگەرە کارامە و لێهاتووەکانی ئەو سەردەمە .

* * *

# تەسلیمبوونی قەلاّی «ڕۆدس»

سوپای دەولّەتـ عوسمانی بە سەرکردایەتیی سولّتان سولەیمانی قانوونی ئابلوقە‌ی دەلاّی «ڕۆدس»ی دابوو

لە ڕۆژی ١٥٢٢/١٢/١٠زدا سولّتان چەنـ دەسپێکی نارد بۆ لای سەرکردەی سوارەکانی «ڕۆدس» کە هەڕەشەی لی بکەن بۆ تەسلیم بوون و خۆبەدەستەوەدان جا ئەگەر خۆیان بەدەستەوە بدەن ئەوا خوێنی خۆی و سوارەکانی دەپارێزێ بەلاّم ئەگەر ملیان بۆ تەسلیمبوون نەدا ئەوا قەلاّکەیان بەسەردا دەڕووخێنێ ..

ئنجا مۆلّەتی سێ ڕۆژیشی دانێ تاکو بڕیاری خۆیانی تێدا بدەن و تەسلیمبوونیان ڕابگەیەنن .

سوارەکانی قەلاّی «ڕۆدس» لە بەردەم ئەم هەڕەشەیەی سولّتاندا بوون بە دوو بەشەوە بەشێکیان پێیان باش بوو ئەم هەلە بقۆزنەوە و سوود لەم لێخۆشبوون و عەفوەی سولّتان وەربگرن ، دوای ئەوەی کە ئومێدیکی ئەوتۆیان نەمابوو بە داکۆکی و بەرگری و خۆڕاگرتن بەلاّم تاقمەکەی تر نەیاندەویست خۆیان بەدەستەوە بدەن هەرچەندەش دەیانزانی کە ناتوانن ماوەیەکی زۆر خۆیان لە بەردەم سوپای سولّتاندا ڕابگرن ، ئەمانە دەیانوت

- گەر بە وێنەی ئەو ڕەفتارەی کە ئێمە لە گەلّ موسلّمانەکاندا کردمان ، سولّتانیش بەو جۆرە ڕەفتارمان لەگەلّدا بکات ، ئەوا بی گومان تۆلّەی ئەو موسلّمانانەمان لێ دەسێنێتەوە کە سەرمان بڕین و قەسابخانە و کوشتارمان لێ دروست کردن بۆیە باوەڕمان بەو بەلّێنەی سولّتان نی‌یە کە دەلّێ «دەتانبەخشم» لەبەر ئەوە ، وامان پێ باشترە کە تەسلیم نەبین و ، لەوانەیە یارمەتیمان لە ئیتالیا و شوێنانی ترەوە بۆ بێت !

وت‌وویژ و مشت‌ومڕی نێوان هەردوو تاقمەکە درێژەی کێشا تا لە ئەنجامدا قسەی تاقمی دووهەم سەری گرت و سێ ڕۆژە مۆڵەتەکەش دوایی هات

دوای تەواوبوونی مۆڵەتەکە سوپای عوسمانی هێرشێکی سەختی کردە سەریان و قەڵاکەیان بە تۆپ داگرتەوە و کەلێنی گەورە گەورەیان لە دیواری قەڵاکەدا دروست کرد ، پاشان چەند لایەکی دیوارەکە بە تەواوی ڕووخا دەرکەوت ئەم قەڵایە لە بەرامبەر موسڵمانان‌دا توانای خۆڕاگرتنی نی‌یە و سەربازەکانی سوپای عوسمانیش هێرش دەکەنە سەریان و لەم دیوارە ڕووخاوانەوە دێنە ژوورەوە

ئا لەم کاتە سەختەدا سوارەکانی ناو قەڵا بڕیاریان دا خۆیان بەدەستەوە بدەن ! لەبەر ئەوە سەرۆکەکەیان دو کەسی نارد بۆ لای سوپای عوسمانی تاکو بڕیاری خۆتەسلیم‌کردنیان پێ ڕابگەیەنن و تکایان لێ بکەن کە پارێزگاریی ژیانیان بکەن !

صەدری ئەعزەم «بەیری محمد پاشـــا» و فەرماندەی گشتی «ئەحمەد پاشا» پێشوازییان لەم دوو نێرراوە کرد تاکو مەرجەکانی خۆبەدەستەوەدانیان لێ ببیستن

سەرکردەی گشتی «ئەحمەد پاشا» پشتی ئەم گفت‌وگۆیەی نەدەگرت و بە صەدری ئەعزەم (واتە سەرەک وەزیران)ی وت

بۆچی گفت‌وگۆ و موفاوەزەیان لەگەڵدا بکەین ؟ خۆ ئەوەتا قەڵاکە خەریکە بە تەواوی دەڕووخێت و بەسەریان‌دا سەردەکەوین ؟ پاشان ئایا ماوەی سێ ڕۆژ مۆڵەتمان بۆ دانەنان لەگەڵ بڕیاری لێخۆشبوون‌دا ، کەچی ئەوان ملیان نەدا و تووشی ئەم جەنگەیان کردین و چەندین سەربازیشمان لێ شەهید بوو وا ئێستا هاتوون داوای تەسلیم بوون دەکەن ؟ چۆن شتی وا دەبێ ؟

صەدری ئەعزەمیش وتی

- ڕاستە بەڵام مەرجەکانیان تەنها بریتی‌یە لەوەی کە پارێزگاریی

ژیانیان بکەین و دەرفەتیان پێ بدەین کە بۆ کوێ دەڕۆن بڕۆن

- بەلاٚم ئەوان بەزەیی‌یان بە موسڵمانان‌دا نەهاتەوە ئایا قەسابخانەکەت لەبیرچووەتەوە کە لە ناو موسڵمانان‌دا ئەنجامیان دا ؟

دوای گفت‌وگۆیەکی درێژ لە نێوان صەدری ئەعزەم و سەرکردەی گشتی‌دا نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێک ، بۆیە بڕیاریان دا بڕۆن بۆ لای سوڵتان سولەیمانی قانوونی تاکو کێشەکەیان بۆ یەکلایی بکاتەوە

کە چوونە ژوورەوە هەریەکەیان ڕای خۆی سەبارەت بەو کێشەیە خستە ڕوو

سوڵتانیش - لە ڕاستی‌دا - مرۆڤێکی میهرەبان بوو لە ڕادەبەدەر سوارچاکی و ئازایەتیی پێ خۆش بوو بۆیە پێی وتن

- ئەو ڕاستی‌یەی کە ناتوانین دانی پێدا نەنێین ئەوەیە کە ئەم سوارانە بەوپەڕی ئازایەتی و مەردانە بەرگرییان لە خۆیان و قەلاٚکەیان کرد گەلێ مایەی سەرسووڕمانی منن بۆیە لێیان خۆش دەبم !

لە ڕۆژی ١٥٢٢/١٢/٢٠زدا ئالاٚی عوسمانی لەسەر قەلاٚکە هەڵکرا و لەسەر بورجە گەورەکەشیەوە بانگ درا و سەربازە عوسمانی‌یەکان لە پشت سەری سوڵتانەکەیانەوە ڕیزیان بەست و نوێژیان ئەدا کرد !

ئنجا سوڵتان ڕوخسەتی دا کە وەفدێکی سوارەکانی «ڕۆدس» (کە پێیان دەوترا سوارەکانی قیددیس جین) بێنە خزمەتی

وەفدی سوارەکان بەناو دوو ڕیزی سوپای موسڵمانەکان‌دا کە لە وەزیران و سەرکردە و پاسەوانەکان پێک هاتبوون ، بەرەو تەختی سوڵتان هاتن و چمکی پۆشاکەکەی سوڵتانیان ماچ کرد وەک نیشانەیەک لەسەر تەسلیم بوونیان

لێخۆشبوون لە چاوانی سوڵتان‌دا دەبینرا تەنانەت پێشتر هەموو موسڵمانانی ئاگادار کردبووەوە کە هیچ وشەیەکی سووکایەتی و گاڵتەپێکردن بەرامبەر بەو سوارانە لە زاریان دەرنەچێ .

سەرۆکی سوارەکان کەوتە قسە و دانی بە تاوانەکانی خۆیاندا نا و هیوا و ئاواتی لێبووردنیشیان لە سوڵتان خواست ..

سوڵتان پێی وتن

- کاربەدەست لە جەنگدا یان سەردەکەوێ یان جەنگ دەدۆڕێنێ ئێوەش وەک پێویست ئەرکی سەرشانتان ڕاپەڕاند و بەوپەڕی ئازایەتی و چاونەترسانەوە بەرگریتان لە قەڵاکەتان کرد  کەواتە هیچ خەمێکتان نەبێ

ئەم مامەڵە سەرتاپا سۆز و ڕێزەی موسڵمانان هەرگیز لە ڕەفتار و مامەڵەی ئەوان نەدەچوو کە لەگەڵ دیلە موسڵمانەکاندا دەیانکرد کاتێ کە دەکەوتنە بەردەستیان ، چونکە یان بە درێژایی ژیانی ئەو دیلانە لە کاری سەختدا دەخرانە کار ، یان لە ژێر زەمینەکانی سزادا بە زنجیر دەیانبەستنەوە و ئەشکەنجەیان دەدان

لە ڕۆژی ١٥٢٢/١٢/٢٩زدا سوڵتان سولەیمان هاوڕێ لەگەڵ وەزیران و فەرماندەکانی سوپاکەی و کۆمەڵێک لە پاسەوانەکانیدا ڕۆشتنە ناو شاری ڕۆدسەوە و گەشتێکی تێدا کرد  دوای ئەوە گەڕایەوە بۆناو سەربازگەکەی لە دەرەوەی شاردا

لە ڕۆژی ١٥٢٣/١/١زدا جارێکی تر پێشوازیی لە سەرەکی وەفدی سوارەکانی «ڕۆدس» کرد کە ناوی «فیلارس دی ئەسلا ئادەم» بوو ئەم سەردانە دوا سەردان و هی خواحافیزی بوو  دوای ئەوە ئەم سەرەک سوارەیە لەگەڵ پیاوەکانیدا کەوتنە ڕێ بەرەو ئەو شارەی هەڵیان بژارد

سوڵتان ئاوڕی لە وەزیران و فەرماندەکانی دایەوە و وتی

- ئایا دەزانن گەلێ خەفەتم بۆ ئەم پیاوە خوارد ؟ چونکە بووین بە هۆی تێکدانی حەوانەوەی لەم تەمەنەیدا

* * *

# سوڵتان سولەیمان و پادشا دیلەکەی فەرەنسا

«فەرەنسیسی یەکەم»ی پادشای فەرەنسا (١٤٩٤-١٥٤٧ز) دوای ئەوەی کە لە جەنگی «بافیا»دا شکستی هێنا لە بەرواری ١٥٢٥/٢/٢٤زدا بە دیلی کەوتە بەردەستی «شـــارکان»ی ئیمپراتوری ئەڵمانیا

لە ئەنجامی ئەمەدا هەریەک لە پادشای «دیل»ی فەرەنسا و دایکیشی «دۆق دانجۆ» سەرونامەیان نارد بۆ گەورەترین ئیمپراتۆر و پادشای ئەو دەمەی ئەورووپا و تەنانەت سەرانسەری جیهانیش کە سوڵتان سولەیمانی قانوونی بوو. لەو نامانەدا تکایان لە سوڵتان دەکرد کە هەوڵو کۆششی خۆی بخاتە گەڕ بۆ ڕزگار کردنی فەرنسیسی یەکەمی پادشای فەرەنسا سەفیری فەرەنسا لە لای دەوڵەتی عوسمانی «دان دوفرانجیان» هەردوو نامەکەی گەیاندە دەستی سوڵتان سولەیمانی قانوونی

بە تایبەتی نامەکەی دایکی پادشای دیل گەلێ کاریگەر بوو ئەمەش پوختەی نامەکەیەتی

«تا ئێستا بۆ ڕزگاربوونی کوڕەکەم لە دیلی پشتم بە ویژدان و مەردایەتیی «شارلکان» بەستبوو ، بەڵام وا نائومێدیم بەدەست هێنا چونکە تا ئێستاش لە سووکایەتی کردن‌دا بە کوڕەکەم هەر بەردەوامە جا لەبەر ئەوەی سەرتاسەری دنیا مەزنی و ناوبانگ و سەربەرزیی ئێوە دەزانن ئەوا تکا لە ئێوەی خاوەن شکۆ دەکەم کە هەوڵەکانتان بۆ ڕزگارکردنی کوڕەکەم بخەنە گەڕ»

هەر کە نامەکەیان بۆ سوڵتان خوێندەوە و بۆیان وەرگێڕا ، ئاوڕی لە وەزیران و یاوەرانی دایەوە و ، بە ئازار و خەفەتەوە وتی

- بینیتان کە دڵی دایک چۆن بە خەم و ئازارەوە بۆ کوڕەکەی دەتلێتەوە ؟

پاشان فەرمانی دا کە دوو وەڵامنامە ڕەوانە بکرێت یەکێکیان بۆ پادشای دیل (فەرەنسیسی یەکەم) و ئەوی تریشیان بۆ دایکی

پوختەی وەڵامەکەی سوڵتان بەم جۆرە بوو :

«بۆ فەرەنسیس» پادشای ئەیالەتی فەرەنسا ! نامەکەتان بە هۆی فرانجیانی سەفیرتانەوە گەیشتە سەڵتەنەت هەروەک لەو ڕێیەوە نامەیەکی سەرزارەکیتان بۆ ناردبووم و لە هەردوو نامەکەوە تێگەیشتم کە دوژمن هاتووەتە وڵاتەکەتانەوە و ئێوەش تا ئێستا هەر لە بەندی دان و دەتانەوێ لەم بارەیەوە یارمەتیتان بدەین

شکست و بەندبوونی پادشایان کارێکی سەیر و نامۆ نییە دەبێ ئێوە لە سوپای ئێمە نائومێد نەبن و بزانن کە شمشێرەکانمان بە شەو و بە ڕۆژ ئامادەن . خوای گەورە چۆنی بوێ هەر وا دەبێت»

لە نامەکەی سوڵتانەوە وا دەردەکەوێ کە وەک ئەیالەتێک دەڕوانێتە فەرەنسا و پادشاکەشی وەک پادشای موقاطەعەیەک دادەنێت ! ئنجا دڵنیای دەکات و ، شکستەکەی لە بەرچاودا دەکات بە شتێکی ئاسایی و، بە چەشنێکی تەماوی و نادیاریش بەڵێنی دەداتێ و دەڵێ

– خواستی خوا چۆن بێت هەر بەو جۆرە دەبێت و سوپا و شمشێرەکانمان هەمیشە ئامادەن !

لە ڕاستیدا سوڵتان نەیدەویست نیاز و پلانەکانی خۆی ئاشکرا بکات سەبارەت بە جەنگ چونکە لەو کاتەدا هەواڵی بۆ هاتبوو کە جیهانی مەسیحی خۆی بۆ هەڵمەتێکی صەلیبیی گەورە و نوێ ئامادە دەکات لە دژی دەوڵەتی عوسمانی بۆیە خۆی بۆ ڕوویەڕووبوونەوەی ئەم هەڵمەتە ساز دەکرد هەر کە بە تەواوی سوپاکەی ساز و ئامادە بوو یەکسەر ڕووەو «مەجەر» کەوتەڕێ و ، لەوێ ڕوبەڕووی سوپای هاوبەشی دەوڵەتە ئەوروپییەکان بووەوە کە لەم هەڵمەتە صەلیبییە نوێیەدا هاتبوون

گرنگترینی دەوڵەتە هاوبەشەکان ئەمانە بوون

«مەجەر، ئەڵمانیا ، ئیتالیا ، ئەسپانیا ، چیکوسلۆفاکیا ، ئەفلاک، بوغدان ، بۆڵەندە ، سەربازەکانی پاپا»

لە ڕۆژی ١٥٢٦/٨/٢٩زدا جەنگی «مۆهاج»ی مێژوویی بەرپا بوو کە جەنگێکی گەلێ سەخت بوو ، بەهۆی زۆری و چڕیی ئەو سوپایانەی بەشدارییان تێدا کردبوو ئەنجامەکەشی سەرکەوتنێکی ڕەنگین بوو بۆ سوپای ئیسلام و شکستێکی گەورەش بوو بۆ پادشایان و سوپا زۆرەکانی ئەورووپا

دوای ئەوەی کە «شارلکان»ی پادشای ئەڵمانیا (کە لەم جەنگەدا بەشداریی کردبوو) ئەم شکستە تاڵەی چەشت ، یەکەم بڕیاری ئەوە بوو وازی لەو تەماعانەی هێنا کە لە شوێنە جیاجیاکانی سەر بە دوڵەتی عوسمانی‌دا هەیبوو دووهەمیش ناچار بوو کە «فەرەنسیسی یەکەم»ی پادشای فەرەنسا لە دیلی ڕزگار بکات چونکە دەیزانی سوڵتان ئارەزووی لە ڕزگارکردنیەتی و واز ناهێنێ تا ڕزگاری نەکات !

* * *

# کابرای جوولەکە و سوڵتان سولەیمانی قانوونی

ئێمە ئێستا لە سەردەمی سوڵتانی عوسمانی «سولەیمانی قانوونی»داین کە دەوڵەت لە سەردەمی ئەودا گەیشتبووە چڵەپۆپەی بەرزی و ترۆپکی بووژانەوە و دەوری زێڕینی

سوڵتان دەی‌ویست مزگەوتێکی ئەوتۆ بنیات بنێت کە لە نێوان مزگەوتەکانی ئەستەمبووڵدا - کە باپیرانی بنیاتیان ناوە - نایاب و دەگمەن بێت مزگەوتێکی زۆر جوان و گەورە بێت و بکەوێتە جوانترین شوێنی ئەستەمبووڵەوە

پیاوانی سوڵتان بەناو شاردا بڵاوبوونەوە تاکو گونجاوترین و لەبارترین شوێن بۆ بنیاتنانی ئەو مزگەوتە هەڵبژێرن

گەلێ شوێن هەبوو کە بۆ ئەو مەبەستە دەست بدات بەڵام شوێنێکیان لە هەموو ئەوانی تر گونجاوتر و فراوانتر و جوانتر بوو کەچی گیروگرفتێکی تێدا بوو ،. ئەویش بریتی بوو لەوەی کە کۆڵیتی کابرایەکی جوولەکە لە ناوەڕاستی ئەو شوێنەدا بوو دەبوو لە پێش‌دا لابرایە تاکو مزگەوتەکەی تێدا بنیات بنرێت

پیاوانی سوڵتان دایان لە دەرگای کۆڵیتەکە کابرای جوولەکە هاتە دەرەوە و وتی

- فەرموون خێرە ؟

- ئێمە پیاوی سوڵتانین و بە شوێن جێگایەکی گونجاودا دەگەڕێین کە بە پێی فەرمانی سوڵتان مزگەوتێکی تێدا دروست بکەین

- جا من چ پەیوەندی‌یەکم بەم مەسەلەیەوە هەیە ؟ خۆ من بەننا نیم!

- ئاخر ئەم شوێنە بۆ بنیاتنانی مزگەوتەکە هەڵبژێرراوەو کۆڵیتەکەی تۆش دەکەوێتە ناوەڕاستیەوە و دەبێ لا ببرێت !

- چی ؟ کۆڵیتەکەم دەڕووخێنن ؟!

- لێت دەکڕین بە پارە .. داوای چەندی لێ دەکەیت ؟
- نەخێر من نامەوێ بیفرۆشم !
- بڕێک پارەی هێندە گونجاوت دەدەینێ کە بتوانی خانوویەکی لەم کۆڵیتە باشتری پێ بکڕیت
- نەخێر .. نەخێر .. من بەم کۆڵیتەی خۆم ڕازیم ڕاستە کۆڵیتێکی بچووکە ، بەڵام - وەک لە پێش چاوتاندایە - بەسەر جوانترین دیمەندا دەڕوانێت کە دیمەنی کەنداوەکەیە !
- چەند قاتی بەهاکەی خۆیت دەدەینێ
- نەخێر .. نیازم نی‌یە بیفرۆشم ئنجا ئەوەش هەیە کە لە شوێنی کارەکەمەوە نزیکە

زۆر هەوڵیان لەگەڵدا دا کەچی هیچ قسەیەک لەگەڵ ئەم جوولەکە سەرسەختەدا سوودی نەبوو ! بۆیە گەڕانەوە بۆ لای سوڵتان و پێیان وت:
- ئەی سوڵتانی بەڕێز ! کۆڵیتی جوولەکەیەک لە ناوەڕاستی ئەو زەوی‌یەدایە کە بۆ مزگەوتەکە هەڵبژێرراوە و خۆتان بە دڵتانە .. ویستمان لێی بکڕین ، بەڵام هەرچی هەوڵمان لەگەڵی دا هەمووی بێ سوود بوو نەی‌دەفرۆشت و ، هەرچەندە پارەی زۆریشمان بۆ دانا ئەو هەر ڕازی نەبوو بیفرۆشێت جا ئەگەر فەرمانتان لەسەری بێت ئەم جوولەکە سەرسەختە دەردەکەین و کۆڵیتەکەی دەڕووخێنین !

سوڵتان سەری نارەزایی ڕاوەشاند و وتی
- نەخێر ئەمە ڕەفتاری ئێمە نی‌یە و ئاینەکەمان بواری ئەوەمان نادات کە ستەم لە کەس بکەین یان بی‌ترسێنین دەبێ چارەیەکی تر بۆ ئەم گیروگرفتە بدۆزینەوە

بەم جۆرە کەوتنە گەڕان بە دوای ڕێگاچارەیەکی شەرعی‌دا و کارەکە بۆ ماوەیەک ڕاوەستا تا لە کۆتایی‌دا سوڵتان لەم بارەیەوە ڕاوێژی بە «شيخ الإسلام» کرد ئەویش وەڵامی دایەوە
- حوکمی ئیسلام - ئەی سوڵتان ! - لەم شتەدا ڕوونە ئێمە ناتوانین هیچ تۆڵە و سزایەک بەسەر ئەو جوولەکەیەدا بسەپێنین لەسەر

ئەوەی کۆڵیەتەکەی نافرۆشێت ، چونکە موڵکی خۆیەتی دروستیش نی‌یە بە زۆرەملێ لێی داگیر بکرێت خۆ ئەگەر بیشمرێت منالەکانی دەبن بە خاوەنی و ئەوانیش دەتوانن نەی‌فرۆشن ، چونکە شەرع بڕیاری لەسەر گواستنەوەی سەروەت و سامانە لە باوکەوە بۆ منالەکانی بە میراتی. بە کورتی ئێوە تەنها یەک ڕێگا چارەتان لە بەردەمدایە ئەویش ڕازی کردنی کابرای جوولەکەیە

سوڵتان کەمێک بیری کردەوە ئنجا ئاوڕی لە پیاوانی دایەوە و پێی‌وتن

– خۆم دەڕۆم بۆ لای و تکای لێ دەکەم کۆڵیتەکەیم پێ بفرۆشێ !

هەروەهاش بوو سوڵتان سولەیمان بۆ خۆی ڕۆیشت بۆ کۆڵیتی کابرای جولەکە و لە سواری ئەسپەکەی دابەزی و لە دەرگای کۆڵیتەکەی دا !

جوولەکەکە هاتە دەرەوە سوڵتانی موسڵمانانی دی لەگەڵ پیاوانی‌دا.. ئەم جولەکەیە گەلێ حەپەسا کە بە گوێی خۆی گوێی لێ بوو سوڵتان تکای لێ دەکرد کۆلیتەکەی پێ بفرۆشێت ! ئەم جارەیان نەی‌توانی دەست بە ڕوویانەوە بنێت ، بە تایبەت سوڵتان چەندین ئەوەندەی بڕی پارەکەی پێشووی بۆ دانابوو !

بەم جۆرە کۆڵیتەکەی لێ کڕی

هەر بەم جۆرەش مزگەوتی «سولەیمانییە» بنیات نرا کە بە یەکێک لە کارە ناوازەکانی هونەری بیناسازیی ئیسلامی دادەنرێت

هەڵس‌وکەوتی سوڵتانیش لەم کارەدا ، یەکێکە لە شایەتەکانی دادگەریی ئاینی ئیسلام ، کە سەرتاپا دادگەری و میهرەبانی‌یە بۆ سەرانسەری گرۆی مرۆڤ بە گشتی

خوای گەورە چەندە ڕاستی فەرمووە

﴿ وَ مَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ ﴾ (الأنبياء:١٠٧)

* * *

# مونازەرەیەك
# لە کۆڕی سوڵتان سولەیمانی قانوونی‌دا

گشت خەڵکی شاری ئەستەمبووڵ باسی پیاوێکیان دەکرد کە هەموو ڕەفتارو گوفتارەکانی نامۆ و سەیرن و کتوپڕ سەری هەڵداوە و بە چەشنێکی سەیر و نامۆ موناقەشەی زانایان دەکات !!

ئەم پیاوە کێ‌یە ؟ لەبارەی چی‌یەوە دەدوێ و موناقەشە دەکات ؟

ناوی «مەلا قابیز»ە دەڵێن لە ئێرانەوە هاتووە ! بابەتی موناقەشەکەشی کە لە ئەستەمبوڵدا ورووژاندبووی لەبارەی حەزرەتی «عیسا» – دروودی لەسەر بێت – و ئایینی نەصرانی‌یەوەیەوە .. دەی‌وت «حەزرەتی عیسا – علیه السلام – لە حەزرەتی محمد ﷺ گەورەتر و بەڕێزترە هەروەک ئایینی نەصرانیش لە ئایینی ئیسلام باشترە» !! لە دەمی موناقەشەکانیشی‌دا هەندێ ئایەتی قورئان و فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەریشی ﷺ دەهێنایەوە و بە چەشنێک تەئویلی دەکردن کە لەگەڵ ئامانجەکانی‌دا بیانگونجێنێت !

دوای ئەوەی کە هەواڵی ئەم پیاوە و موناقەشە نامۆکانی لەناو دانیشتوانی شاری ئەستەمبووڵدا بڵاوبووەوە و خەڵکی بێزاریان لێ دەردەبڕی «صەدری ئەعزەم» یەکێکی نارد بە شوێن ئەم پیاوەدا تاکو بیت بۆ کۆڕی سوڵتان سولەیمانی قانوونی

ئەم پیاوە گەلێ بەم بانگێشتە دڵخۆش بوو ، چونکە پێی وابوو لە ورووژاندنی ئەم گێژەڵووکەیە لە شاری ئەستەمبووڵدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە و ، بووە بە پیاوێکی بەناوبانگ ، تەنانەت ناوبانگی گەیشتووەتە لای سوڵتان سولەیمانی قانوونیش کە بێ گومان لە کۆڕی خۆی‌دا موناقەشەیەکی لەگەڵ زاناکانی‌دا بۆ ساز دەکات گەلێ متمانەشی بەخۆی هەبوو کە لەو موناقەشەیەدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێ بەسەر

نەیارەکانی‌دا

لە کاتی دیاری‌کراودا «مەلا قابیز» ئامادەی دیوانی سوڵتان بوو «صەدری ئەعزەم» لەگەڵ چەند وەزیرێک‌دا دانیشتبوون ، هەروەک دوو کەسی تریش لەوێ بوون بە بەرگی زانایانەوە کە زووتر نەی‌بینیبوون بەڵام سوڵتان سولەیمان خۆی لە پشتی پەردەیەکەوە دانیشتبوو گوێی لە موناقەشەکەوە بوو بێ ئەوەی کەس بیبینێ !

«صـــەدری ئەعزەم» یەکەم جـار کـەوتە قســـە و لە «مەلا قابیز»ی پرسی : ئایا هەواڵی ئەو موناقەشە و ئیددیعایەی لە بارەتەوە بلاوبووەتەوە راستە ؟ ئەویش تەسدیقی کرد و پشتی ئەو هەواڵەی گرت ئنجا صەدری ئەعزەم داوای لێ کرد بەڵگەکانی بخاتە روو پێیشی وت : کە دوو زانای بۆ موناقەشەکردنی هێناوە یەکێکیان موفتیی ئەنادۆڵە و ئەوی تریشیان موفتیی رۆملی‌یە ئەمەی وت و ئاماژەی بۆ دوو زاناکە کرد

«مەلا قابیز»دەستی کرد بە شەرحی دەعواکەی و هێنانی ئەو ئایەت‌و فەرموودانەی کە پێی وابوو پشتی بۆچوونەکانی دەگرن

ئنجا دوو زاناکە وەلامیان دایەوە و روونیان کردەوە کە ئایەت و حەدیثەکان بە خراپی‌و نابەجێ تەئویل دەکات‌و بە هەڵە لێکیان دەداتەوە‌و تەفسیریان دەکات ئنجا واتای راستەقینە و تەفسیری تەواوی ئەو ئایەت و فەرموودانەیان خستە پێش‌چاو

بەڵام «مەلا قابیز» لەسەر هەڵوێستی خۆی هەر سوور بوو و سەرسەختیی بۆ راکەی خۆی نواند !

موناقەشەکە چەند سەعاتێکی خایاند ، بێ ئەوەی چ سوودێکی ببێ لە ئەنجام‌دا دوو زاناکە تووڕەبوون و پێیان وت

- ئەم گوفتارەی تۆ بە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام دادەنرێت و دەبێ سزای «مورتەد» بدرێت گەر پەشیمان نەبیتەوە و واز لە راکەت نەهێنی!

بەڵام «صەدری ئەعزەم» هیچ هەڵوێستێکی خراپی لەگەڵ نەنواند و بواری دا کە بە سەربەستی بڕوات !

دوای ڕۆشتنی «مەلا قابیز» سوڵتان سولەیمانی قانوونی  کە گوێی لە هەموو موناقشەکە بوو ، ناردی بە دوای صەدری ئەعزەمدا و پێی‌وت:

- بۆچی هێشتت بڕوات ؟ ئەی خۆت گوێت لە دەعوا بەتاڵەکانی نەبوو ؟

- بەڵێ گەورەم ! گوێم لێ بوو ، بەڵام «فیکر» دەبێ بە «فیکر» بەرەنگاری بکرێ نەک بە «هێز» ! ئێمە لەم کۆڕەدا نەمانتوانی بەسەری‌دا زاڵ ببین ، بۆیە هێشتم بڕوات .

- کەواتە پێت وایە چار چی‌یە ؟ هەر وا بواری بدەین ژەهرەکانی بڵاو بکاتەوە ؟

- نەخێر  گەورەم !  بەڵام دەبێ لە پێش‌دا بە موناقەشە بی‌بەستینەوە و بۆڕی بدەین ، ئەو کاتە سزای مورتەددی لەسەر جێ‌بەجێ دەکەین .

- جا ئەگەر ئەو هەر ئاوا سەرسەخت بێ، چۆن دەتوانین بۆڕی بدەین و لە موناقەشەدا بی‌بەستینەوە ؟

- گەورەم ! یەک زانا هەیە ئەم کارەی لە تواناداا بێت

- کێ‌یە ؟

- شێخولئیسلام و زانای پایەبەرز  «إبن الكمال» !

- کەواتە بە خێرایی بانگی بکە و با لە حوزووری خۆمان‌دا موناقەشەی لەگەڵدا بکات

* * *

بۆ جاری دووهەم کۆڕی مونازەرە لە حوزووری سوڵتان سولەیمانی قانوونی‌دا ساز کرا و ، «مەلا قابیز» بەوپەڕی لەخۆبایی‌بوون و خۆشحاڵی‌یەوە هات و ئامادە بوو ..شادمانی ئەو ناوبانگە بوو کە بە

دەستی هێنابوو    بەڵام ئەم جارەیان زانایەکی لە جۆرێکی تری لە بەردەمی خۆیدا بینییەوە    ئەم جارە خۆی لەبەردەم زانای بەناوبانگ «إبن الكمال»دا بینییەوە !

ئەم جارە مونازەرەکە درێژەی نەکێشا ، چونکە «إبن الكمال» هەموو رێگایەکی لە «مەلا قابیز» گرت و گشت دەرگایەکیشی لە بەردەمدا داخست و بە زانستەکەی خۆی ئابلۆقەی ئەوی دا و دەمکوتی کرد و بۆری دا و قسەی پێ بڕی . «مەلا قابیز»یش لە ناچاریدا سەری داخست و بێدەنگ بوو    سوڵتان گوێی لە هەموو ئەو قسانە بوو کە لە مونازەرەکەدا ڕووی دا    خۆ کاتێ کە «مەلا قابیز» دەمکوت کرا گەلێ دڵخۆش بوو

«إبن الكمال» ماوەیەک چاوەڕوانی وەڵامی «مەلا قابیز»ی کرد ، کە بێدەنگییەکەی درێژەی کێشا ، داوای تۆبە و پەشیمانیی لێ کرد و پێیوت    دەنا بە مورتەد دادەنرێت و حوکمی مورتەددی بەسەردا جێبەجێ دەکرێ !

بەڵام «مەلا قابیز» لەم شکستەیدا هەستی بە ئیهانە و سووکایەتی کرد و ، لە بریی تۆبە و پەشیمانی و ئیستیغفار گرفتاری لووتبەرزی بوو بەم تاوانەی    جا دوای ئەوەی هەڵەی دەعواکەی بۆ ڕوون بووەوە ، دەستی کرد بە جنێودانێکی نابەجێ و نەشیاو بە «إبن الكمال» !

بەڵام ئەم جارە مۆڵەت نەدرا    بەڵکو دووچاری سزای خۆی بوو کە سزای مورتەددە !

* * *

# سوڵتان سەلیمی دووهەم

*چەند زانیاری‌یەکی مێژوویی لەبارەیەوە*

ناوی باوکی : سوڵتان سولەیمانی قانوونی

ناوی دایکی  خورڕەم سوڵتان .

بەرواری لەدایکبوونی  ١٥٢٤/٥/٢٨ز

بەرواری چوونەسەرتەختی : ١٥٦٦/٩/٣٠ز

بەرواری کۆچی دوایی : ١٥٧٤/١٢/١٥ز

گرنگترین کارە جەنگی‌یەکانی

* گرتنەوەی شاری ئەدەنە

* فەتحی دوورگەی قوبرس

* فەتحی «توونس» بۆ جاری دووهەم بەهۆی سەرکەوتنی لە جەنگی «بوغدان»ی بەناوبانگ‌دا

* فەتحی گەلێ قەلاّ لە ئەورووپادا

سوپا دەریایی‌یەکەی لە جەنگی «ئینابەخت»ی دەریایی‌دا لەبەردەم سوپای دەریایی خاچ‌پەرستەکان‌دا شکستی هێنا

* * *

# فەتحی دوورگەی قوبرس

چەتە دەریایی‌یەکانی ڤینیسیا دوورگەی قوبرسیان کردبوو بە بنکە و مەڵبەندی خۆیان و لەوێوە دەڕۆشتن دەستیان بەسەر کەشتی‌یە بازرگانی‌یەکان‌دا دەگرت و تالانیان دەکرن و کەشتیوان و سواربووانی ئەو کەشتییانەیان بە دیل دەگرت ، هەروەک دەستیان دەهێنایە ڕێی ئەو کەشتییانەی کە حاجییانیان هەڵدەگرت و هەر کەسێکیان تێدا دەبوو دیلیان دەکردن و ئەو دیلانەش یانە دەکران بە «کۆیلە» یان دەکوژران !

سوڵتان سەلیمی دووهەم و خەڵکیش لەتاو ئەو چەتە دەریایی‌یانە بە تەواوی دڵتەنگ و بێزار بووبوون هەروەک کاری کردبووە سەر جم‌وجووڵی بازرگانیش و بەو هۆیەوە نوشوستیی هێنابوو .

کاتی خۆی سوڵتان سەلیمی دووهەم کە وەلی عەهد بوو ، تکای لە باوکی خۆی (واتە سوڵتان سولەیمانی قانوونی) کردبوو کە سنوورێک بۆ خراپکاری و دەست درێژیی ئەو چەتانە دابنێت و دوورگەی قوبرس فەتح بکات و ئەوانەی لێ بەدەر بنێت

بەڵام باوکی سەرگەرمی فتووحاتی گەلی لەوە گرنگتر بوو بۆیە پێی‌وت

– کوڕم ! گەر خوای گەورە فەتحی قوبرسی بۆ ئێمە ئاسان نەکرد ئومێدەوارم کە بۆ ئێوەی ئاسان بکات

ئەوە بوو کە نزیکەی ساڵ‌ونیوێک بەسەر حوکمڕانیی سوڵتان سەلیمی دووهەم‌دا تێپەڕی نەخشەی ساز کرد بۆ گرتنی «قوبرس» بۆ ئەم مەبەستەش ناردی بە دوای دوو وەزیری خۆی‌دا کە ناویان «لالە مصطفی پاشا» و «بیالا پاشا» بوو کە هاتن بۆ لای گرتنی قوبرسی پێ سپاردن و داوای لێ کردن ئەو فەساد و خراپکاری‌یە لەوێ نەهێڵن کە

چەتە دەریایی‌یەکان لەم بەشە گرنگەی دەریای سپیی ناوەڕاستدا ناویانەتەوە و کارێ بکەن کە ئاسایش و دڵنیایی بۆ ئەو ناوچەیە بگێڕنەوە ئنجا یەکەم وەزیریشی کرد بە سەرکردەی ئەم هەڵمەتە

لە ڕۆژی ١٥/٥/١٥٧٠زدا سوپای دەریایی عوسمانی لە ئەستەمبووڵەوە کەوتە ڕێ و ، هەموو خەڵکی شار کۆبوونەوە و دەستیان بۆ سەربازەکان و فەرماندەی هەڵمەتەکە بەرز دەکردەوە و دوعای سەرکەوتنیان لە خوای گەورە بۆ دەکردن

کاتێ ڤینیسی‌یەکان هەواڵی نیازی سوڵتانیان بیست کە دەیەوێ هەڵمەتێکی دەریایی‌یان بکاتە سەر، یەکسەر وەفدێکیان نارد بۆ لای پاپا و تکایان لێ کرد کە یارمەتییان بدات ، پاپایش سوپایەکی دەریایی لەگەڵ هەندێ سەربازدا بە پەلە ناردە فریایان

لە ڕۆژی ١/٧/١٥٧٠زدا ئوسطۆلی عوسمانی‌یەکان گەیشتە ئاوەکانی شاری «لیماسۆل»ی قوبرس و لە ڕۆژی دوای ئەوەدا سەربازەکان دابەزینە وشکایی و هێرشیان کردە سەر قەڵای «لافتاری» و دەستیان بەسەردا گرت پاشان دەستیان بەسەر شاری «کیرنا»دا گرت و ، دوای ئەوەش بەرەو پێش چوون و ئابڵۆقەی شاری «لفکوشا»یان دا و لە ڕۆژی ٩/٩/١٥٧٠زدا گرتیان پاشان ڕوویان کردە گەورەترین قەڵای ئەو کاتەی قوبرس کە ناوی «ماکۆسا» بوو و کاربەدەستە ڤینیسی‌یەکەی تێدا بوو ، ڕۆشتن و ئابڵۆقەیان دا

قەڵاکە گەلێ قایم و سەخت بوو ، هەروەک وەرزی زستانیش هاتبووە پێشەوە بۆیە عوسمانی‌یەکان ناچار بوون چاوەڕوانی بەسەرچوونی وەرزی زستان بکەن

کاتێ «نیکۆلا داندۆلا»ی فەرمانڕەوای گەمارۆدراوی قوبرس بینیی عوسمانی‌یەکان سوورن لەسەر ئابڵۆقەدانی قەڵاکەی ناردی بە شوێن سەرکردەی سوپاکەی‌دا کە ناوی «براکادینۆ» بوو تاکو لەبارەی ئەم هەڵوێستە بێ ئومێدەوە ڕاوێژی پێ بکات ، لێی‌پرسی

- ئەی «براکادینۆ» ! تۆ دەڵێی چی ؟ هیچ هیوایەکمان هەیە ؟
- گەورەم ! ڕێی هاتنی یارمەتیی دەرەوەیان لێ بڕیوین و وا ئێستاش چەند مانگێکە گەمارۆی قەلاّکەیان داوین هەروەک لەوەش ناچێ نیازیان وابێت واز لەم گەمارۆیە بهێنن تا دەست بەسەر قەلاّکەدا نەگرن
- کەواتە چار چی‌یە ؟ ئایا جگە لە موفاوەزە و گفت‌وگۆ هیچ ڕێگاچارەیەکی ترمان هەیە ؟
- نەخێر گەورەم ! هیچ ڕێگاچارەیەکی تر شک نابەم .
- کەواتە تەنها ڕێگای موفاوەزەمان لە بەردەمدایە کە لەسەر مەرجەکانی «خۆتەسلیم کردن» لە گەڵیاندا گف‌وگۆ بکەین بۆیە دەمەوێ وەفدێک بنێرمە لایان بۆ ئەم مەبەستە .
- گەورەم ! من ئامادەم سەرکردەیی ئەم وەفدە بگرمە ئەستۆ
- باشە لاریم لێی نی‌یە

* * *

وەزیری .عوسمانی «لالە مصطفی پاشا» پێشوازیی لە وەفدی موفاوەزە کرد کە بە سەرۆکایەتیی «براکادینۆ»ی سەرکردە هاتبوون
دوای ئەوەی کە گوێی لە داواکاریی وەفدەکە ڕاگرت سەبارەت بە دەرچوونی خۆیان و سامانیان لە قەلاّکە پێی وتن
- باشە ئەمە قبووڵ دەکەین ، ئێوە دەتوانن بە سەلامەتی دەربچن و بۆ هەر وڵاتێک حەزتان لێیەتی بڕۆن بەلاّم دەبێ ئەو کەشتی‌یانەمان بۆ بگێڕنەوە کە چەتەکانتان دەستیان بەسەردا گرتوون
- بەڵێ باشە دەیانگێڕینەوە بەلاّم دوای ئەوەی کە بە سەلامەتی گەیشتینە جێی خۆمان !
- جا کێ گەڕانەوەی کەشتی‌یەکانمان بۆ دەستەبەر دەکات ؟ بە تایبەتی دوای ئەوەی کە ئێوە لە دەستمان دەردەچن ؟ بۆیە من ئەوەتان بۆ پێشنیار دەکەم کە یەکێک لە سەرکردەکانتان بە بارمتە لای ئێمە دابنێن ،

جا هەر ئەوەندەی کەشتی‌یەکان گەیشتنەوە دەستمان ئێمەش بارمتەکەتان بۆ بەردەدەین

- ئەمەیان ناتوانین !

وەزیر ڕق و داخی خۆی لەم وەڵامە خواردەوە و هیچ شتێکی نەدایە ڕووی ، بۆیە هەر لە گفت‌وگۆدا بەردەوام بوو

- دەبێ لەم ڕووەوە بگەینە ئەنجامێک هەروەک داواتان لێ دەکەین هەموو ئەو دیلانەمان بدەنەوە کە لە کاتی دەست بەسەردا گرتنی کەشتی‌یەکان‌دا گرتووتانن

- ئەمەش موستەحیلە ناتوانین تەسلیمیان بکەینەوە !

- بۆچی ؟

- چونکە هەموویانمان کوشتوون !!

ئا لێرەدا «لالە مصطفی» ئارامی لا بڕا و بە تووڕەیی‌یەوە لە شوێنەکەی خۆی هەڵسایە سەرپێ و دەم‌وچاوی سوور هەڵگەڕا و پزیسک لە چاوانیەوە دەردەپەڕی و وتی

- ئەی تاوانبارینە ! دیلەکانی ئێمە دەکوژن ؟ لە کاتێک‌دا کە ئێمە تەنانەت یەک دیلی ئێوەشمان نەکوشتووە ؟ دەسا دەبێ ژیانتان لە بەهای ئەم تاوانە مەزنەدا دابنێن

ئنجا فەرمانی بە پاسەوانەکانی دا کە هەموو ئەندامانی وەفدەکە لە تۆلەی دیلەکان‌دا بکوژنەوە

یەکسەر ڕۆژی دوای ئەمە ، هێرش بۆ سەر قەلا سەختەکە دەستی پێ کرد و چەند ڕۆژێکی خایاند قەلاکە درایە بەر تۆپ تا ڕۆژی ١٥٧١/٨/١ز بە تەواوی دەستی بەسەردا گیرا

* * *

# سوڵتان مورادی چوارەم

*چەند زانیاری یەکی مێژوویی لەبارەیەوە*

ناوی باوکی    سوڵتان ئەحمەدی یەکەم .

ناوی دایکی : ماهـ پەیکەر کەوسەم سوڵتان

بەرواری لەدایکبوونی : ١٦١٢/٧/٢٧ز

بەرواری چوونەسەرتەختی    /١٦٢٣/٩/١٠ز

بەرواری کۆچی دوایی : ٨-١٦٤٠/٢/٩ز

گرنگترین کارە جەنگی یەکانی

* سەرکردەیی هەڵمەتێکی کرد لە دژی «بۆڵەندە» دوای ئەوەی کە سەرپێچیان نواندبوو لە پەیمانێک کە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی دا بەستبوویان و ، بەم هەڵمەتە ناچاری کردن دەست بە پەیمانەکەیانەوە بگرن !

* سەرکەوتنی بەسەر صەفەوی یەکان دا بەدەست هێنا و شاری «تەورێز» و چەند قەڵایەکیشی لە ئێران دا گرت .

* بەغدای خستە سەر دەوڵەتی عوسمانی

* * *

# فیراسەتی سوڵتان

سوڵتان موورادی چوارەم بیستی کە یەکێک لە سەرەک پشکنیارەکانی شارەوانیی شاری ئەستەمبووڵ بەرتیل لە خەڵکی دەسێنێ ! لەبەر ئەوە یەکێکی لە پیاوانی خۆی بانگ کرد و پێی ڕاسپارد کە بە پەنهانی چاودێریی ئەو کەسە گومانلێ‌کراوە بکات تاکو بزانێ ئەو تۆمەتەی دراوەتە پاڵی ڕاستە یان نا ؟

دوای یەک مانگی ڕەبەقی چاودێری ئەم پیاوە گەڕایەوە بۆ لای سوڵتان و ئەنجامی چاودێرییەکەی خستە بەردەست و وتی

- گەورەم ! هیچ ڕەفتارێکی گومانلێکراوم لەم ماوەیەدا لێ نەدیوە لەو باوەڕەدام کە تۆمەتەکە درۆ بێت

- بەڵام من باوەڕ ناکەم خەڵکی لەم سکالایەدا درۆ بکەن ، چونکە هەرگیز دووکەڵی بێ ئاگر نابێ پێم وایە تۆ فیراسەتی تەواوت نەبێت !

ئنجا سوڵتان ئیزنی پیاوەکەی دا

بۆ ڕۆژی دوای ئەوە ، سوڵتان ناردی بە دوای خودی پیاوە گومانلێ‌کراوەکەدا (واتە سەرەک پشکنیارەکەی شارەوانیی ئەستەمبووڵ) کاتێ کە ڕۆشتە ژوورەوە ، سوڵتان کیسەیەک پارەی دایێ و پێی‌وت :

- کارێکت پێ دەسپێرم دەبێ ئەنجامی بدەیت .. بیستوومە پیاوێکی هەژاری دەست‌کورت هەیە بەیانیان نوێژ لە مزگەوتی «ئەیا سۆفیا» دەکات و لە فلانە گۆشەی مزگەوتەکەدا ڕادەوەستێ بەیانی بڕۆ ئەم کیسە پارەیەی بدەرێ

- بەسەر چاو گەورەم !

ئەم پیاوەش ئەرکەکەی سەرشانی بەجێ هێنا و نوێژی بەیانی ڕۆشت بۆ مزگەوتی ئەیا سۆفیا هەژارەکەی لەو شوێنەدا دۆزی‌یەوە کە سوڵتان

باسی کرد کیسە پارەکەی دایێ و پێی‌وت :

- ئەم کیسە پارەیە بگرە .. سوڵتان بۆی ناردوویت

- خوا دەست بە تەمەنی سوڵتانەوە بگرێت و سەری بخات

بۆ ڕۆژی دوای ئەمە سوڵتان فەرمانی دەرکرد سەرەک پشکنیارەکەی شارەوانی بخرێتە بەندیخانەوە !!

ئەو ئەوەندەی ئەم هەواڵە لەناو خەڵکی‌دا بڵاوبووەوە هەموویان خۆشحاڵ بوون ، چونکە لە دەست ئەم کارمەندە بەرتیل‌خۆرە ڕزگاریان بوو

بەڵام وەزیرەکانی سوڵتان سەریان لەم کارەی سوڵتان سوورمابوو ، چونکە دەیانزانی سوڵتان هیچ کەسێک بەبێ چەسپاندنی تاوانەکەی سزا نادات ، ئەی داخۆ چۆن توانیویەتی بۆی دەربکەوێ کە ئەو تۆمەتە ڕاست بووە ؟

سوڵتان پێی‌وتن :

- ئەو هەژارەی ناو مزگەوتەکە یەکێک بوو لە پیاوە نەناسراوەکانی خۆم منیش ویستم دەستپاکیی ئەم پشکنیارە تاقی بکەمەوە بۆیە ئەم کارەم پێ سپاردو کیسەیەک پارەم دایێ کە پەنجا لیرەی زێڕی تێدا بوو ، کەچی ئەو کاتێ کیسەکەی تەسلیم کرد تەنها پێنج لیرەی تێدا بوو واتە چل‌وپێنج لیرەی لێ لادا بوو ! ئیتر بۆم دەرکەوت کە مرۆڤێکی دەست‌پیسە و جێی بڕوا و متمانە نی‌یە !

* * *

# نامۆترین ناو کە لە مزگەوتێک نراوە

بەڵێ ، نامۆترین ناوە کە لە هەموو جیهاندا لە مزگەوتێک نراوە !
دەنا مزگەوت هەیە ناوی «وابزانە خواردم» بێت ؟!
ئایا کەس ناوی وا سەیری بیستووە ؟

کەچی لە ڕاستیدا ئەمە ناوی مزگەوتێکە لەناوچەی «فاتیح» لە شاری ئەستەمبوڵ و ناوی مزگەوتەکەش بە تورکی «صانکی یدم Sanki Yadim» واتە «وابزانە خواردم» یان «وا دابنێ خواردم» !

ئەم ناوەش بەسەرهاتێکی سەیر و ناوازەی هەیە کە پەندێکی مەزنی تێدایە .جا بۆ ئەوەی بەسەرهاتی ڕاستەقینەی ئەم مزگەوتە بزانین ، وا لاپەڕە (١١٩)ی بەرگی یەکەمی کتێبی «مزگەوتەکانی ئەستەمبوڵ Is-tanbul Camileri» دەکەینەوە کە دانراوی «تەحسین ئۆز Tahsin Oz»ە بۆ ئەوەی بەسەرهاتی مرۆڤێکی خاوەن وەرع بخوێنینەوە کە لە ناوچەی «فاتیح»دا ژیاوە و ناوی «خیر الدین کججی ئەفەندی» بووە

ئەم مرۆڤە کە بە بازاڕدا گوزەری دەکرد و دەروونی حەزی لە خواردنی هەر میوە ، یان گۆشت ، یان شیرینییەک دەکرد ، نەیدەکڕی و لە دڵی خۆیدا دەیوت «وابزانە خواردم» ! ئنجا بڕی پارەی ئەو میوەیە یان ئەو گۆشتە یان ئەو شیرینییەی دەخستە ناو سندووقێکەوە !

بەم جۆرە مانگ لە دوای مانگ و ساڵ لە دوای ساڵ خۆی لە خواردنی شتی خۆش دەگرتەوە و تەنها ئەوەندەی دەخوارد کە مایەی ژیانی بێت لەگەڵ ئەمەشدا پارەی ناو سندووقەکە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیادی دەکرد تا توانیی بەم پارە پاشەکەوت کراوە مزگەوتێکی خنجیلانە بنیات بنێت !

جا لەبەر ئەوەی خەڵکی گەڕەک بەسەرهاتی ئەم مرۆڤە خاوەن

وەرعەیان دەزانی و ئاگادار بوون کە چۆن توانیویەتی ئەم مزگەوتە بنیات بنێت ، ئەوا ناوی «صانكي يدم»یان لەو مزگەوتە نا !

ئەگەر سەردانی ئەستەمبوولّت بە نسیب بوو و لەناوچەی «فاتیح»دا رێت کەوتە کۆلانی: «Kirbaci Nam» ئەوا لە ناوەندی خانووە کۆنەکانی ئەو گەڕەکەدا چاوت بەم مزگەوتە دەکەوێ ، کە شایەتە لەسەر زوهدێکی قورأنی ئەم مرۆڤە هەژارەی کە سەرەڕای هەژارییەکەی توانیی دوای خۆی پاداشتێکی هەمیشەیی بۆ ژیانی هەتاهەتایی خۆی بەجێ بهێڵێ

خوای گەورە لێی خۆش ببێت و پاداشتی زۆری بداتەوە ئامین

مامۆستا «نوورسی» ڕێزی لەم ڕەفتارە وەرعی‌یە ناوە و ئاماژەی بۆ ئەم مرۆڤە و بەسەرهاتەکەی کردووە ، ئەوەتا دەڵێ

*«هەرکاتێک تام و لەزەتەکان بانگیان لە مرۆڤ کرد ، دەبێ بە «وابزانە خواردم!» وەلام بدرێنەوە چونکە ئەو کەسەی ئەمەی کرد بە دەستووری ژیانی ، مزگەوتێکی نەخوارد کە دەی‌توانی بیخواردایە »* !

وصلى الله على إمام المرسلين سيدنا محمد وآله وصحبه أجمعين .

وآخر دعوانا أن : ﴿الحمد لله رب العالمين﴾

* * *

# سەرچاوە مێژوویی‌یەکانی دانەر

1- Osmanli Padisahlari Ansiklopedisi. Yeni Asya Yayinlari. (Yavuz Bahadir Oglu)
Istanbul-1986

2- Mufassal Osmanli Tarihi. Bir Hayet Tarafindan Yazilmistir. Sehir Matbaasi.Istanbul-1957.

3- Osmanli Fazilet Mucadelesi. Tahsin Amal. Sebil Yayin evi.
Istanbul.1968.

4- Zafer Mecmuasi.

5- Yeni Nesil Gazetesi / Tarih Kosesi . Istanbul.

6- Sani Tarihimiz. Bahadir Aip. Yeni Asya Yayinlar. Istanbul.

7- Zaferlerimiz. Burhan Bozgayik. Yeni Asya Yaynlar.Istanbul

8- Bin Yildir Yasayanlar. Necmedin Sahiner.Yani Asya Yay inlar.Istanbul.1967.

* * *

# پێرست

| باس | لاپەڕە |
|---|---|
| پێشەکی ........................................ | ٣ |
| ئورخان غازی ........................................ | ٦ |
| بەرەو کیشوەری ئەوروپا بە هەشتا موجاهیدەوە | ٨ |
| سوڵتان موورادی یەکەم ........................................ | ١٣ |
| سوڵتانی شەهید ........................................ | ١٤ |
| سوڵتان بایەزیدی یەکەم ........................................ | ١٩ |
| «حەق» و «صەلاحییەت» ........................................ | ٢٠ |
| ئەو پادشایەی کە شایەتیی وەرنەگیرا | ٢٢ |
| صەموونچی بابا | ٢٤ |
| سوڵتان موورادی دووهەم ........................................ | ٢٨ |
| وەفدی گاورەکان بۆ لای سوڵتان مووراد ........................................ | ٢٩- |
| وەلی و .. سوڵتان ........................................ | ٣٣ |
| سوڵتان محمدی دووهەم (فاتیح) | ٣٦ |
| دەروێش و سوڵتان محمد فاتیح ........................................ | ٣٨ |
| سینان پاشا و .. سوڵتان محمد فاتیح | ٣٩ |
| محمد فاتیح و .. مامۆستاکەی ........................................ | ٤٢ |
| دادگەریی دادگا | ٤٣ |
| سوڵتان بایەزیدی دووهەم ........................................ | ٤٦ |
| یەکەم نوێژ لە مزگەوتی بایەزیددا | ٤٨ |

# روائع من التأريخ العثماني

تأليف
أورخان محمد علي

نقله من العربية إلى الكردية
فاروق رسول يحيىٰ

الطبعة الأولى
١٤١٨هـ - ١٩٩٨م



ژمارەی سپاردن بە کتێبخانەی نیشتمانی هەرێمی کوردستان (١٣٥) ساڵی ١٩٩٨

# ئەم کتێبە



• سەرجەمی موسڵمانان یەک نەتەوەن ؛ ﴿إِنَّ هَٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً﴾ (الأنبياء:٩٢) . لەبەر ئەوە ، مێژووی هەر گەلێکی موسڵمان موڵکی هەموو نەتەوەی ئیسلامە .

• هەست کردنیش بەم هاوبەشی‌یە لە «مێژوو» و «چارەنووس» و «[illegible]» ڕوحی‌یەکان‌یەدا گرنگترین پەیوەندی‌یە کە گەلانی نەتەوەی ئیسلام بە یەکەوە گرێ دەدات .

• جا ئەم پەیوەندی‌یەی نێوان گەلانی موسڵمان گەورەترین نیشانە بووە کە تیری دوژمنانی ئاراستە کراوە ، بۆ ئەوەی نەتەوەی ئیسلام لاواز بکەن و لەسەر نەخشەی جیهان‌دا نەیهێڵن .

• بەڵام ئێستا پێشەنگی ڕابوون و بێداریی ئیسلامی لە سەرتاسەری جیهان‌دا دەیەوێ نەتەوەی ئیسلام بەخەبەر بێنێ و ، لە مەترسیی شوێنکەوتەیی فیکری و سیاسی و داگیرکاریی شارستانێتی ڕزگاری بکات .

• بۆیە دەبێ مێژووەکەمان (مێژووی نەتەوەی ئیسلام) سەرلەنوێ بخوێنینەوە و لێی تێ بگەین ، نەک بۆ ئەوەی تەنها لە ڕابوردوودا بژین ، بەڵکو بۆ ئەوەی کەسایەتی و ڕەگ و ریشەی خۆمان بزانین و پێی ئاشنا بین .

چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین/هەولێر